١

# شانازیی مرۆڤایەتی

محمد صلى الله عليه وسلم

پێغەمبەری ڕەحمەت بۆ جیهانیان

# نووری نەمر

محمد فتح الله گولەن



شانازی مرۆڤایەتی

# نووری ئەمر

# ١

## پێغەمبەری ڕەحمەت بۆ جیهانیان


نووسینی

**محمد فتح الله گولەن**



وەرگێڕانی

**دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان**

چاپی یەکەم

**کانوونی یەکەم - ٢٠١٢**

**تیراژ : ٥٠٠٠ دانە**

چاپی دووەم

**کانوونی دووەم - ٢٠١٣**

**تیراژ: ١٥.٠٠٠ دانە**

**ژمارە سپاردنی (٢٢١٨)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی پێدراوە.**

**شوێنی چاپ**

Nese
Basım-Yayın

Neşe Matbaacılık - İstanbul

+٩٠ ٢١٢ ٨٨٦ ٨٣٢٠

www.nesematbaacilik.com

دیزاینی ناوەوە

دۆستی مێدیا ـ هەولێر





**دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان**

www.irfanpublishing.com

# پێڕستی بابەتەکان

## بەشی یەکەم

## تایبەتمەندیی پێغەمبەران و پێغەمبەری سەروەرمان

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، والصَلاةُ والسَلامُ عَلى سَيدِنا مُحَمَّدٍ وعَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينْ

# پێشەکی

باسکردنی کەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی موحەممەد موستەفا(ﷺ)، زیاد لە باسکردنیش پێشکەش کردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و، ئیکسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەکانی، هەروەها ناساندنی ژیانی مویارەکی بە شێوەیەك شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، لەو بابەتە گرنگانەیە کە وەك زۆر کەسی تر، دنیای هزر و هەستی منیشی خستبووە ژێر فشارەوە و، لە هەموو ڕوویەکەوە بووبووە خواست و خولیایەکی بەرنەگیراو...

ئەو(ﷺ) مایەی شانازی مرۆڤایەتییە. ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا، گەورەترین بیرمەند و کەڵە فەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناکبیرانەش کە هەر یەکەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لە دوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و، لە ڕوویدا دەڵێن: " تۆ ئەو مرۆڤەیت کە شانازی بە شوێنکەوتەییتەوە دەکەین."

بۆ گەورەیی ئەو ئەوەندە بەسە کە سەرباری ئەو هەموو تێکدان و کاولکارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا کراون، کەچی هێشتا لە منارەکانەوە زایەڵەی"أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ" دەبیستین و شاباڵ گرتەی ڕۆحی ڕەوانی موحەممەدی بە هەموو لایەکدا دەبینین و، لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا

ڕۆژی پێنج جار دێینه جۆش و خرۆش.. دیسانەوە سەبارەت بە مەزنی و شکۆی ئەو دەتوانین بڵێین: سەرەڕای هەوڵی سەرومڕی دوژمنانی دین لە ناوەوە و دەرەوەدا، لە پێناو گومڕاکردن و لەڕێ لادانی نەوەی نوێ، کەچی وا ئەمڕۆ چەندەها لاوی تازە پێگەیشتوو، هەرچەند لە قۆناغێکی زەمەنی ئەوتۆدا دەژین کە دەرککردنیان بە "حەقیقەتی ئەحمەدی" وەك پێویست سەخت و دژوارە، کەچی چەشنی بەرەو پیرچوونی پەروانە بۆ ڕووناکی، بەرەو حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) دەڕۆن و ، بەم کارەشیان هەڵوێستێك دەنوێنن کە لە دنیادا هاوتای نییە. دەستی زەمەن کۆتاتر بوو لەوەی بتوانێت هیچ حەقیقەتێکی تایبەت بەو لە ناخماندا کۆن و ڕەنگپەڕ بکات. بەڵێ، ئەو هێشتا تەڕو تازەیە لە سینەماندا، هەروەك زۆرجار بە دۆستەکانیشم دەڵێم: هەرکات دەچمە مەدینەی مونەووەرە، بۆن و بەرامەی ئەو بە جۆرێك دەمپێچێت، دەڵێیت هەنگاوێك لەولاترەوە بەخۆی شاددەبم و، بە دەنگە ژیانبەخشەکەیەوە پێم دەڵێ: " مَرْحَباً، أهْلاً وَ سَهْلاً " و بەخێرهاتنم دەکات. جا ئیتر پێغەمبەری خوا(عَلَيۡهِ‌ٱلصَّلَاةُوَٱلسَّلَامُ) لە نێوماندا تا ئەو ڕادەیە زیندە و تازەیە و، هەر واش بە تازە و پاراویی دەمێنێتەوە.

بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت. هەروەك چۆن هەندێك فیکر و بۆچونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون. بەڵام ئەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدە (ﷺ) کە لە دڵی ئیمانداراندا وەك خونچەیەك وایە کە هەر ڕۆژە و زیاتر دەپشکوێت و، دائیم لە نوێبوونەوەدایە.

پێم وایە ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن، بمانتوانیبایە پێغەمبەری نازدار باس بکەین ـ کە بەداخەوە نەمانتوانیوە ـ، بەو ئەندازەیەش کە کەسانی تر باس دەکرێن و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە

بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایـە، ئـەوا ئـەو کاتە لە دەروونی نەوەکانی ئەمڕۆدا تەنها ئەو تـەختی دادەنـا و، دڵـەکانیش تەنها بۆ ئەو لێیان دەدا.. وێڕای هەموو ئەمانە، لە خۆرهەڵات و خۆرئـاوای دنیادا، ڕۆژ دوای ڕۆژ مرۆڤەکان، هەریەکە و بە گۆزەکەی دەستیەوە بەرەو ئەو سەرچاوە سازگار و خاوێنە ڕادەکەن کە بە"منهل العذب المورود" ناوی دەبەم و، کۆششی ئەوە دەکەن بگەنە مـەنزڵی ئـەو سـوڵتانەی کـە تـاج لەسـەری خۆرەکان دەنێت.

بەڵێ، ئەمڕۆ لە زۆربـەی وڵاتـانی جیهانـدا، لـە پێشـی هەمووشـیانەوە ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا تێبینی بووژانەوەیەك دەکـەین ڕووەو ئەو. لە زۆر جێگەشدا موسوڵمانان بە کەرەسـتەی ڕسـتنی بەردەسـتیان، بـە چوستی سەرگەرمی ڕستنی بنەماکانی بەرنامەکەی ئەون و، نەخش و نیگاری ناسك و دڵڕفێن دەربارەی ئیسلام دەچنن. هەر دەڵێیت ڕۆحیـەتی "عەصـری سەعادەت" سەرلەنوێ لـە نێـو موسـوڵمانانداا زیندووبووەتـەوە. بـارودۆخی جیهانی ئیسلامیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمە نییە... ئەوەتا لـەبری ئەوانەی کە یەك دوو سەدە لەمەوبەر بەبێ هیچ داوەرییەکی ژیریی و هەروا بە ساکاری هاتبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە، ئەمڕۆ چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار هاتووەتە گۆڕێ، کە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی لایەنەکانی ئیسلام دەکـات و، لـە ژێـر شـەبەنگی پرشـنگداری زانسـتدا شـوێن حـەزرەتی مُوحەمـەد(ﷺ) کەوتووە... ئەوانەی تا ئـەمڕۆ توێـژی خوێنـدەوارانیان بـۆ مـەرامی خۆیـان بەکاردەهێنا و، زانکۆ و مەڵبەنـدەکانی فێربوونیـان کردبـووە شـوێنکەوتەی تاقمێـك"...یزم"و، دەزگـا نیشتیمانیەکانیشـیان بـۆ بەرژەوەنـدی کـوفر

وەگەڕخستبوو، لەمەودوا هەروەك توانەوەی شەختە سەهۆڵینەکان یەك لەدوای یەك دەتوێنـــەوە و بـەخێرایـی بەرەو رسـول الله(صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەچن.

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و، وێڵی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یان درەنگ، مایەپووچی و بێ ئاکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە. ئەوە مۆریس بۆکای و رۆجی گارودی و چەندەهای تری نەناسراویش...

بەڵام داخـۆ ئێمـە وەك پێویسـت ئـەو سـوڵتانی دڵانـەمان ناسـیوە کـە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداریی دەکات؟ جا بۆچی ئێوە سەغڵەت بکـەم! ئایـا منێك کە لە پێنج ساڵییەوە سەرم لە سـوجدەدایە و، خـۆم بـە "قطمیر"[1]ی گەردن بەستراوی دەرگانەکەی دەزانم، توانیومە بە تەواوی بیناسێنم؟ یاخود تا چەند سەرکەوتوو بووم لە گەیانـدنی ئـەوەی کـە دەیـزانم؟ جـا لێـرەدا ڕووی گوفتارم دەکەمە هەموو ئەوانەی وان لە مەقامی ناساندنی ئـەودا و، خۆشـم دەخەمە ڕیزیانەوە و دەڵێم: ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تـەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی ئەو بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و، بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و، چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. ئـیتر ئـەو کـات بـۆ چـوونە نێـو

---

[1] - قطمیر ئەو ناوەیە کە لە سەگەکەی "أصحاب الكهف" نراوە.

جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە، دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکا...

لەکاتێکدا ئادەمیزاد هێندەی ئاشنایی و ناسینی، خۆشەویستی ئاراستەی شتان دەکات، بەرامبەر ئەو شتانەش کە نایزانێت و ئاشنایی نییە، هەردەم جۆرێك لە دوژمنایەتی نواندووە. هەر بۆیە ئەو خاڵەی کە دوژمنان بە درێژایی تەمەنیان هەوڵەکانیانی تیادا چڕدەکەنەوە، بریتییە لە سڕینەوەی "نامی جەلیلی موحەممەدی" لە یادگەکاندا و، گۆشکردنی نەوەی نوێ لەسەر دوژمنایەتی کردنی فەخری کائینات(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ). بەڵام ئەوە چ درەوشانەوەیەکی لوتف ئامێزە کە سەرەڕای خواستی دوژمنان بۆ ڕیشەکەن کردنی ناوی ئەو لە دەروونەکاندا، کەچی وا ئەمڕۆ تێکڕای بەربەستەکانی گەیشتن بەو تەی کراون! نەخوازەڵا لاوان کە وەك دڵخۆشیی یەکێك کە لە بیاباندا لە تینواندا خەریك بووبێت بمرێت، لە پڕێکدا و بە شێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوانی نەکردبێت، لە پەنا سەریدا ئاوێکی سازگاری کەوسەر ئاسای دەستکەوتبێت، ئاوەها بەو چەشنە خۆیان هەڵدەدەنە ئامێزی پڕ سۆزی ئەوەوە. بێگومان ئەو سینە پڕ سۆز و میهرەش لە ئامێزیان دەگرێت و، هەرگیز ئەوانە مەحرووم ناکات کە بەرەو لای ئەو دێن.

نازانم، قەت سەرنجی ئەو کەسانەتان داوە کە لە ڕۆژانی هەینیدا مزگەوتەکان سەرڕێژ دەکەن؟ ئەگەر بەدیقەتەوە سەرنجتان دابێت، ئەوا بینیوتانە کە زۆربەی ئەو کەسانە لە گەنجانن. داخۆ دەبێت ئەو پاڵنەرە چی بێت کە لەبەرامبەر پەلکێشکاری بەرنامە بۆ داڕێژراوی نەوەکان بۆ نێو گێژاوی ترسناکی گومڕایی و توغیاندا، وای لەو گەنجانە کردووە کە بەبێ

گوێدانه ساردو سڕی زستان و، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵدەلەرزن لـە سـەرمادا، دەستنوێژ بگرن و لە ناهەموارترین بارودۆخەکاندا بەرەو مزگەوتەکان هەنگاو بنێن؟ گەر پێتان باش بێت مـن وەڵام دەدەمـەوە: ئـەوە جازیبـەی قودسـیی حەزرەتی موحەممەدە(ﷺ)...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شـەمعە، ئـەو خـۆرە.. لـە داهاتوویـەکی زۆر نزیکدا، ئەو عـەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیووە بـەرەو ئەو بدەنە پرتاو و، بە وێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کـەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵـێن: " ئـاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟ " بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بێت و هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبێت...

جیهان بە هەڵـەداوان بـەرەو لای ئـەو دێـت. ئـەوەتا ناوەنـدە زانسـتی و ئەکادیمییەکان لێکۆڵینـەوەی لەسـەر دەکـەن و، ئـەو دەروونانـەش کـە والآن بەرووی جیهانی فیکردا شوێنی دەکەون و، زۆرێکیش لەوانەی کە تا ڕۆژانێـك لەبەرەی دوژمنانیدا بوون، دەبنە دۆستی زۆر نزیك و دەچنە داڵدەی ئـەوەوە، هەروەك بەڕاستیش چوون... ئیدی ئەمڕۆ تەنانەت بە پێوانە و کێشـانەکانی بەرەی بەرامبەریش حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) سەنگی خۆی هەیە و، ئـەوانیش دان دەنێن بە قەدر و گەورەییەکەیدا... پێغەمبـەری خوا لـە فەرموودەیەکـدا دەفەرموێ: " بە دەکەس لە ئوممەتەکەم کێشـرام، مـن سـەنگینتر دەرچـووم. ئەوجا بەسەد، لەپاشان بەهەزار کەس کێشرام، دیسـان هـەر مـن سـەنگینتر بووم. لەبەرامبەر ئەمەوە ئەو دوو مەلائیکەتـەی بـەم کـارە ڕاسـپێررابوون، وتیان: وازبێنە، خۆ ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەشی بکێشرێ، هێشتا هەر ئەم

قورستر دەبێت." [1] جا خۆ ئەوەش هاتە دی. پێغەمبەری خوا یەکێك لەو خەونانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دیویەتی: " لە تایەکی تەرازوودا من و لە تاکەی تریشیدا هەموو ئومەتەکەم دانرا، من سەنگینتر بووم." [2]

بەڵێ، ئەگەر سەرجەم ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش و، ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەصفیا و موقەڕڕەبین، هەر هەموویان لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، ئەوا دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان قورستر دەبێت. ئاخر بوون لەبەر حورمەتی ڕووی ئەو بەدی هێنراوە.

پێغەمبەری خوا هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە. لە وتەیەکدا کە وەك فەرموودە ناوبانگی دەرکردووە، بەم جۆرە باسکراوە: لَوْلاَكَ لَوْلاَكَ مَا خَلَقْتُ اْلأَفْلاَكَ. [3] " ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا." بەڵێ، نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێ هودەیە. خوای گەورەش لەهەموو کارێکی بێ هودە و بەهەوانتە پاك و بێگەردە. بەم جۆرە، زۆر پێویست بوو کە ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واتای دێرەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە. هەروەك چۆن بوونی ڕاڤەکارێك (شارِح) و گەیەنەرێك (مُبَلِّغ) پێویست بوو، تا ڕاستییەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات. هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بێ بن بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕام

١- الدارمي، المقدمة، ٣ ـ بزار، المسند ٤٣٧/٩ـ الهيثمي، مجمع الزوائد ٢٥٥/٨
١- أحمد إبن حنبل، المسند ٧٦/٢ ـ الهيثمي، مجمع الزوائد ٥٨/٩
٢- علي القاري، الأسرار المرفوعة ٣٨٥ ـ العجلوني، كشف الخفاء ٢١٤/٢

کراوە، ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لە کوێوە هاتووە.. بۆ کوێ دەڕوات.. و نامزەدی چ شتێکە... کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبووایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو... بەڵێ، حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتان گەڕاندەوە. ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویستترە لامان.

لێرەدا ـ لەگەڵ دان نانم بەوەی کە خۆم بە گوناهبارترینی باوەڕداران دەزانم ـ هەستێکم هەیە، بێ باسکردنی تێناپەڕم. نیازیشم لـە گێڕانـەوەی ئەوەیـە: ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەری خوام خۆشبوێت، کێ دەزانێ مەشخەڵی ئەوینی ئەو لەو دڵانەدا کە لێهاتنیان هەیە، تا چ پلەیەك بڵێسەی سەندووە!.. بۆیە دەبێت لەم سۆنگەیەوە بڕوانرێتە ئـەو حاڵەتـە ڕۆحییـەی دەیگێڕمـەوە. گەرنا، پێم شەرمە لە حزوورتاندا باسی شتێك بکەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

ئەو کاتەی خوای گەورە کردی بە نسیبم دەموچاوی گوناهکارم بسووم بەو خاکە موبارەکەدا، شارەکەی پێغەمبەری خوا هێندە درەوشـاوە بـوو لـەلام و چێژێکی ڕۆحیی وام چەشت، کە ئەگەر لەو کاتەدا ـ بە فەرزی مەحاڵ ـ لـە هەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگهێشت بکرامایە، باوەڕبکەن نەدەچووم بۆ هیچ کامێکیـان و، مانـەوەم لـە شـارەکەی رسـول الله دا پەسـەند دەکـرد. لەڕاستیدا بەهەشت ئاوات و ئارەزووی هەموومانـە، تاکـە موسـوڵمانێکیش نییە کە ئەم ئاواتەی نەبێت. ئەی مەگـەر هـەموو بـەیانی و ئێوارانێـك لـە دوعاکانماندا، لە پەروەردگار ناپاڕێینەوە کە پەنامان بدات لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە؟ لەگەڵ قبوڵکردنی هـەموو ئەمانـەدا، دەڵـێم: ئەگـەر لـەو کاتەدا بانگ بکرامایە بۆ بەدەست هێنانی ئەو پایە بەرزەی کـە لـە دواڕۆژدا بەدەست دێت، لەوانەیە مۆڵەتم لە پەروەردگارم بخواستایە و عەرزی ئارەزووی مانەوەم بکردایە لە ڕەوزەی پاکی رسول الله دا. تکا دەکەم وا گومـان نەبـەن

بەمانە شایستەیی و لێهاتوویی خۆم بۆ ئەو مەقامە بەرزانە دەربڕیبێت. بەڵکو تەنها ویستوومە ئاماژەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ پێغەمبەری خوام هەیە. ئەگەرنا بەدرێژایی ژیانم لەو کەسانە بووم کە دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە کە خوای گەورە شەرەفمەندیان بکات بەوەی کە ببنە کۆیلەی گەردن بەندی بچوکترین صەحابیی پێغەمبەری خوا. زۆرجاریش ئەم دوعایە ویردی سەر زبانمان بووە: " پەروەردگارا، بۆ ساتێکیش بێت، لە خولیای دەموچاو سوینمان بە تۆزی بەر پێیان بەدوورمان مەگرە." ئامین.

لە "ماڵی خوا"شدا ناخم لە هەمان جۆش و خرۆش تەژی بوو. لەوانەیە ئەمانە هەست و نەستی هاوبەشی هەموومان بێت. ماوەتەوە بڵێم، ئەوانەی پڕاوپڕ لەم هەستانەدا دەژین تەنها من و چەند کەسێکی هاوشێوەی من نین، بەڵکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەیدا و ئەویندارى وای هەیە، ئەم حاڵەتە ڕۆحییەی من گێڕامەوە بەلای ئەوانەوە زۆر کرچ و کاڵ و سەرەتایی دەبێت.

جا مادەم باس گەیشتە ئێرە، پێم خۆشە بیرەوەرییەکی تریشتان عەرز بکەم: لەگەڵ کاك عارف حیکمەت کە ئەو کاتە ئەندام پەرلەمان بوو، لە حەج پێکەوە بووین. کاك عارف پەیمانی دابوو کە: " ئەگەر بچمە مەدینە، شەرت بێ وەك گوێدرێژ لە خۆڵەکەیدا خۆم بگەوزێنم." جا هەر کە پێی نایە خاکی مەدینەوە، پەیمانەکەی هێنایە جێ و، ئەو ڕۆحە بەرزە خۆی لە خۆڵدا گەوزاند و تەپاوتلی تیا دەکرد. لێرە و لەوێ هەرکات ئەو دیمەنم دێتەوە یاد، خۆم پێناگیرێ و چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسك.

حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەرێکە. بەڵام پێغەمبەرێك کە گشت پێغەمبەرانی پێش خۆی، لە منارەی پێغەمبەرایەتییانەوە مزگێنی هاتنیان داوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو پەیمانەمان بۆ تۆمار دەکات کە لە

سەرجەم پێغەمبەرانی وەرگرتووە سەبارەت بە باوەڕهێنان و پشتیوانی کردنی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆیان مژدەی هاتنیان داوە:

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ (آل-عمران:٨١)

" (یادیان بێنە) کاتێک خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت، کاتێک کتێب و دانایی پێبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو، ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن، ئینجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتاندا و پەیمانی منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بڕیارماندا و (هەروا دەکەین) ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان."[1]

ئیتر ئەو پێغەمبەرانەش لەو پەیمانەیاندا کە بە پەروەردگاریان دابوو، ڕاستگۆ بوون و لە هەموو جووڵە و کردەیەکیاندا لەو چوارچێوەیەدا مانەوە. ئەوەتا کاتێك سەروەرمان میعراجی کرد، هەموویان بە ڕۆحیانەت لەدوایەوە نوێژیان کرد.[2] بەڵێ، وەك بلێی هەموو پێغەمبەران(ﷺ) لە پێشی هەمووشیانەوە، حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا دەیانویست ببنە بانگبێژ و قامەت خوێنی. حەزرەتی مەسیح

---

١- بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سوود لە "تەفسیری ئاسان" نوسینی بورهان محمد أمین وەرگیراوە.

٢- مسلم، الأيمان ٢٧٨.

له ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرە قەدر بەرزەی دەخستە بەر چاو و، دەیوت: " مــن دەڕۆم تا سەرداری زەمان بێت."[1] بـەڵێ، ئـەو دەمــەی بـەرەو ئاسمـان بڵنـد بووەوە، دامێنی ئاسمانەکان پڕ بوون لە گەوهەر و ئەستێرەکان بەوێنەی بەردی سەرڕێ، لەژێر پێیدا ڕاخـران . کـاتێکیش خـۆر گەیشـتە ئاسـۆی حـەزرەتی موحەممەد(ﷺ)، خولیا و سەودای سەری بووبووە ئەوەی ببێتە گەوهـەرێك لـە تاجەکـەی موسـتەفادا. بـەڵێ، هــەموو ئەمانــە وەك پەروانــە بــەدەوری پێغەمبەرایەتییەکەیدا پـەرواز ببـوون و دەسـووڕانەوە. ئـیتر لەمانـەوە چـی دەربچێت:

" لەتاو شەمعەی نووری ئەحمەد جبریل بووە پەروانە،

لەتاو جەماڵی نووری موحەممەد مەلەك پەروانە ئاسا

سەرگەرمی سووڕانە..."

هاودەم لەتەك ئەمانەشدا، لە ڕوانگەی خەسڵەتە ئادەمییەکانیشەوە لە لوتکەدا بوو و ڕابەرایەتی و پێشەنگیی ئێمەی ئادەمیی دەکرد. بۆ نموونە، پێغەمبەری خوا سەرۆك خێزانێکی کامڵی بێ هاوتا بوو. ئەوەتا لە ماوەیەکی دیاریکراوی ژیانیدا، نۆ دانە ئافرەت لە ژێر نیکاح و بەڕێوەبردنی ئەودا بوون.[2] لەگەڵ ئەمەشدا بواری نەدا لە نێوایاندا هیچ جۆرە دەمەقاڵێ و بارگرژییەك ڕوویدات. جا ئەگەر ئەو ڕۆڵانەی لەو خانەیەدا ـ کە ئیکسیری نبووەتی تنۆك تنۆك لێدەچۆڕی ـ گۆش و پەروەردە کران، هەریەکە و بەسەر سەدەیەکدا دابەش بکرانایە، ئەوا دەبوونە موجتەهید و موجەددیدانێك کە

١ - یوحنا، باب: ١٦، ڕستەی: ٧-١٥.

٢ - البخاري، النکاح ٤، ١٠٢.

بەس بن بۆ ڕۆشن کردنەوەی ئەو سەدەیە. داخۆ دەبێت چەند کەس لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوایان ناسیبێت!..

حەزرەتی فەخری عالەم(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) لە هەمان کاتدا سەرکردەیەکی سەربازیی بێ وێنە بوو. ئەوەتا بە مشتێك مرۆڤەوە کە وەك خەرمانەی مانگ دەوریان دابوو، جەنگی بەڕووی جیهاندا ڕاگەیاند و، تەخت و سەرای چەندین گەورە سوڵتانی یەکسانی خاك کرد و، چەندینی تریشیانی کردە بەندەی بەر دەرگانەکەی. ئەمە لەکاتێکدا کە بە ڕواڵەت هونەر و زانستی جەنگیی لە کەسەوە فێرنەببوو.

ئینجا پێغەمبەری نازدار، ئەو مرۆڤە مەزنە بوو کە زانستەکان لای ئەو دەگەیشتنە پایان. دەتوت لە شاشەیەکدا تەماشای ئەو ڕووداوانە دەکات کە تا ڕۆژی قیامەت دێنە سەر شانۆی بوون. یان هەروەك ئەوەی لە تۆمارێکی غەیبیدا بیانخوێنێتەوە، ئاوا لەیەك بە یەکیان دەدوا. تەنانەت دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش بەسەر کۆچکردنیدا بۆ خانەی جاویدانی، کەچی وا ئەمڕۆ هەموو لایەکمان لەو کۆتا خاڵەدا کە زانست و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەم پێی دەگات، ئەو بەیداخە شەکاوەیە دەبینین کە رسول الله(ﷺ) چواردە سەدە لەمەوپێش هەڵی کردووە.. ئیدی ئەوانەیان کە خوای گەورە هیدایەتی لەچارە نووسیون، " کەلیمەی قودسییەی تەییبە" دەهێنن و، هەر یەکێکیان دەبێتە ئەڵقەیەکی نوورین لە زنجیرە کاروانی موسوڵمانانەدا. ئەمەش نموونەیەك لە نێو هەزاران نموونەدا:

لە کاسێتێکی ڤیدیۆیدا تەماشای دکتۆرێکی بەڕەگەز کەنەدیم کرد کە ناوی " کیث مۆر"بوو. ئەم دکتۆرە پسپۆڕی زانستی کۆرپەلەزانی و پرۆفیسۆری توێکارییە لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی تۆرۆنتۆ. مۆر کاتێك لە

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە گوێبیستی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە دەبێت لە سکی دایکدا، کە ڕاستییەکی زانستییە و تەنها لە ڕێگەی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی ئەم سەردەمەوە دۆزراوەتەوە، یەکسەر " أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ " دەڵێت و تەسلیمییەتی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەردەبڕێت. هەروەها زانایەکی فیسیۆلۆجی یابانیش، کاتێك ئایەتەکانی قورئان سەبارەت بە بوارەکەی خۆیەوە دەبینێت " أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ " - هەرچەندە لەسەر زاریشی گران بوو - دەڵێت و، ساتێك دوودڵ نابێت لەوەی کە بێتە ناو ئیسلامەوە.

بەڵێ، هەروەك ئاشکرایە، لەو شوێنەدا کە زانستەکان دەچەقن و پەکیان دەکەوێت، قورئانی پیرۆز چەندین دەروازەیان بەڕوودا والآ دەکات. کۆتا خاڵیش کە زانست و زانیاری پێی بگات، لەگەڵ خاڵی دەسپێکی پێغەمبەری خوادا یەکدەگرێتەوە. باشە، بەلاّم کێ ئەمانەی فێرکردووە؟ ئەو دەرسی لە زاتی " العَلِيمْ" و " الخَبِيرْ"ەوە وەگرتبوو و، "موعەللیمی ئەزەلی" لەودیو ڕەحلەی تەدریسەکەیەوە بوو. هەربۆیە دەستی زەمەن نەگەیشتە چمکی مەعریفەتەکەی تا کۆنی بکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پاراوتر و نوێتر دەبێتەوە. هەتا دنیاش دنیا بێت، هەمیشە لە تازەبوونەوەدا دەبێت.

ئینجا حەزرەتی حبیب الله(ﷺ) بە شێوەیەك کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەڕەخسابێت، لەلایەن هاوەڵانییەوە خۆشدەویسترا. بۆ نموونە: لە کۆتایی ڕووداوی "ماء الرجيع"دا، کاتێك کافرانی دڵ پڕ لە قین "خوبەیبی کوڕی عەدی"یان ڕاپێچی پەتی سێدارە دەکرد، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستە کرد: " ئایا پێت خۆش بوو ئێستا موحەممەد لە جێگەی تۆدا بووایە و، تۆش لەناو ماڵ و

منالّی خۆتدا بــه ئاســوودەیی بژیایتایــه؟ " وەلاّمــی ئــەم پرســیارە، ڕوون و یەکلایی و بێ پەروا بوو:

" نەخێر، وەڵڵاهی لەپای ڕزگاربوونی مندا، ڕازی نابم تەنانەت دڕکێکیش بچێت بە پێی پێغەمبەری خوادا."

جا لەپاش نواندنی ئەم تابلۆ مەردانەیە لەسەر سەکۆی سێدارەدا، حەزرەتی خوبەیب(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و، دەڵێت: " خوایە گیان، بەبێ ماڵئاوایی کردن لە خۆشەویستەکەت هاتم بۆ ئێرە. دەسا سەلامی منی پێ بگەیەنە." پێغەمبەری خوا کە لەو کاتەدا لەنێو ئەصحابدا دانیشتبوو و قسەی دەکرد، لە پڕ هەستایەوە سەر پێ و، فەرمووی: " سەلامی خوا لە تۆش ئەی خوبەیب." کاتێکیش هاوەڵان پرسیاریان کرد، بەچاوی پڕ فرمێسکەوە فەرمووی: " موشریکەکان خوبەیبیان شەهید کرد. لەدوا ساتەکانیدا سەلامی بۆ ناردم، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە." [1]

دیمەنێکی تر، کە تا ئێستاش دڵگوشادیی دەبەخشـێتە دەروونــی هــەموو ئیماندارێك: کاتێــك حــەزرەتی "ســومەیرا" لــە غــەزای ئوحــوددا دەنگــۆی شەهیدکردنی پێغەمبەری خــوا دەبیســتێت، دەســتبەجێ خــۆی دەگەیەنێتــە دامێنــــی چــــیای ئوحــــود... جــــا کــــە لــــەوێ پێــــی دەڵــــێن: "باوکــت".."مێردەکەت".." کوڕەکانت" شــەهیدبوون و، تەرمــەکانیانی پــێ نیشان دەدرێت، ئەم شێرە ژنە گوێ بە هیچ کــام لەمانــە نــادات و، بــەملاو ئەولادا هەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەڕا و، لەبەر خۆیەوە ورتەی دەهات و ، دەیوت: " رسول الله چی بەسەر هاتووە؟ " ئینجا کە شوێنی پێغەمبــەری

---

١ - سعيد بن منصور، السنن ٣٤٩/٢ ـ الطبراني، المعجم الكبير ٢٦٠/٥ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٤.

خوایان نیشاندا، به ڕاکردن بەرەو ئەویّ ڕۆیشت و لەبەردەمیدا خۆی دا بە زەویدا و، دەیوت: كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ. " ئیتر پاش ئەوەی تۆ لە ژیاندایت، هەرچی بەلاّو موصیبەت هەیە، سووك و بێ ئەرزشە." [1] بەلّێ، رسول الله(ﷺ) ئا بەو شێوەیە لە دلّ و دەروونەکاندا جێی خۆی کردبووەوە.

نموونەیەکی تر: مەردی ئاسۆکان، لەودیوی ئاسمانەکانەوە بانگهێشت کرابوو و، ئیدی ئەو دۆستانەی بەجێ دەهێشت کە ٢٣ سالّ پێکەوەییان هەبوو. لەبەر ئەمە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا کەمێك بە دلّتەنگی و خەفەتەوە دەچووە لای هاوەلاّنی. ئەم حالّەتەی پێغەمبەری خوا هێندە کاری لە ئەصحاب دەکرد و هەستی دەبزواندن، بە جۆرێك کە پێغەمبەر دەچووەوە خانەی سەعادەتی، دەتووت لە سینەی هەر یەکێکیاندا شنەی خەزان هەلّی کردووە. موعاذی کوڕی جەبەل(رضي الله عنه) لەلایەن پێغەمبەری خواوە ڕاسپێردرابوو کە بچێت بۆ یەمەن. ئیتر ئەویش لەو نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. کاتێك دەڕۆیشت پەیامەکانی پێغەمبەری دەبرد و کە دەشهاتەوە ئەو مەسەلە و گرفتانەی دەهێنا کە چاوەڕوانی چارەسەر بوون. بەر لەوەی دوایەمین گەشتی ئەنجام بدات، چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، داوای دوعای لێدەکرد، ئنجا دەڕۆیشت. بەلاّم ئەمجارەیان حەزرەت جیاواز لە جارانی پێشوو، پێی فەرموو: " لەسەر خێر بڕۆیت ئەی موعاذ، بەلاّم ئەمجارەیان لەگەڕانەوەتدا لەوانەیە تەنها بتوانیت سەردانی مزگەوتەکەم و گۆڕەکەم بکەیت." ئەم چەند وشەیە، برووسکەیك بوو و دای لە حەزرەتی موعاذ. لە پەلوپۆ کەوت و فرمێسك لە

١ - إبن هشام، الصراط النبوية ٥٠/٤ ـ الطبري، تأريخ الأمم و الملك ٧٤/٢ ـ الهيثمي، مجمع الزوائد ١١٥/٦.

چاوانی دادەبارین و دەتوت ئەژنۆی شکاوە. چوون بۆ یەمەن با لەولاوە بوەستێت، تەنانەت توانای نەبوو لە شوێنی خۆشی هەستێت.[1]

لەلایەکی ترەوە، پێغەمبەری خوا هەروەك موو لـە ماسـت دەربهێنێـت، ئاوها بە ئاسانی سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی چارەسەر دەکرد کە تایبـەت بوون بە ژیانی کۆمەلآیەتییەوە. "بەرناردشۆ" کە سـیازدە سـەدە دوای ئـەو هاتووە، تەنها یەکێکە لەو سەدان مرۆڤەی بەرەی بەرامبەر، کە بـەو وتانـەی خوارەوەی ئەم ڕاستییەی قبوولّ کردووە: " مرۆڤایەتی چەندە ئاتاجی حەزرەتی موحەممەدە، کە هەموو کێشەو گرفتە کەڵەکەبووەکانی ئەم چەرخەی بە وێنەی سانایی خواردنەوەی کوپێك قـاوە چارەسـەر دەکـرد." فەزیلـەت و گـەورەیی ئەوەیە کە دوژمنیش دانی پێدا بنێت.

بەڵێ، ئەو کاتەی مرۆڤایەتی بۆ لای حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) دەگەڕێتەوە، بە ئاسوودەیی و دڵنیایی شاددەبێتەوە. ئیتر ئەوکات دەستی دەگاتە ئاسۆ پرشنگەکان و، لە دەربەدەری و گاڵتەجاڕیی دەستی ڕۆژگار و پەژموورردەیی دنیاو ئاخیرەت ڕزگاری دەبێ و بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزدەبێتەوە. تەنانەت لەگەڵ کۆسپ و ڕێگریی هەموو هێزە نەیارەکانیشدا، سروەی ئەم دووهەمین بوژانەوەیە دەستی پێکردووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴾ (الصف: ٨-٩)

---

١ - احمد إبن حنبل، المسند ٢٣٥/٥ ـ البزار، المسند ٩١/٧-٩٢ ـ إبن حبان، الصحيح ٤١٤/٢ ـ الطبراني، المعجم الكبير ١٢١/٢٠

" ئەوانە دەیانەوێت بە فوو، بە قەڵەی دەم نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی، ئاینی خۆی، تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت هەرچەندە کافر و بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت. هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە موشریک و هاوەڵگەڕان پێیان ناخۆش بێت."

بەڵێ، خوای گەورە دینەکەی خۆی سەردەخات، سینەو دڵە ئاتاجەکانیش کەمەندکێشی دەبن و، بەختەوەری و دڵنیایی خۆیان لەودا دەبیننەوە و دەگەنە ناستێك، هەر لە دنیادا وا دەزانن چوونەتە بەهەشتەوە. جا کافر و ستەمکارانی دنیای ئەولا و، مونافیقانی ئاسیاش کە ئیستیثماری مرۆڤەکان دەکەن و بێئاگایانی ناوخۆشمان پێیان خۆش بێت یان نا، ڕۆژێك دێت ئەو شاهی شاهانەی لەلایەن پێغەمبەرانەوە بە "سولتانی ئەنبیا" ناسراوە و، ڕۆژی پێنج جار ناوی پڕشکۆی بە گوێی جیهاندا دەدرێت، دەچێتە نێو گشت دڵەکانەوە و دەبێتە خۆشەویست و لە دڵدا هەڵگیراوی هەموو لایەك.

ئەو کانگای دڵنیایی و ئارامیشە. ئێمە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی کە ئەو پەیامەی ئەو هێناویەتی، لەهەمان کاتدا سەرچاوەی ئاسودەیی و دڵنیاییشە. مێژووش گەورەترین شاهیدی ئەم ڕاستییەیە. تاکە ڕێگەی دووبارە چەشتنەوەی ئەم ئارامیەش بە مرۆڤایەتی، بریتییە لە ناساندنی ئەو سەروەرە و ئەو نوورەی هێناویەتی. چونکە هەرکات مرۆڤایەتی چاکتر ئەو پێغەمبەرەی ناسی، خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێ و، لە سایەی ئەو خۆشەویستییەشدا سیمای کۆمەڵگە دەگۆڕێت.[1]

---

١- حەزرەتی عەلی(ﷺ) بەم شێوەیە باسی پێغەمبەری خوای دەکرد: مَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ .
" هەرکەس ـ ئاکارە بەرزەکانی ـ بزانیایە و تێکەڵاوی بکردایە، ئەوی ـ لە هەموو شتێك ـ

جا لە چوارچێوەی ئەم پێشەکیەدا کە پێشینان بە "دیباجە" ناویان دەبرد، پشت ئەستوور بە لوتف و کەرەمی پەروەردگار، هەوڵماندا بەکورتی چەند شتێکی پێڕست ئاسا دەربارەی لایەنە جیاوازەکانی سەروەری هەردوو جیهان، مایەی شانازی بوونەوەران عەرز بکەین.

لەڕاستیدا، هەر وتەیەك باس لەو بکات جوان و شیرینە. ئەوەش کە جوان و پەسەند نییە، دەبێت بدرێتە پاڵ دەربڕین و شێوازەکەی. جا ئەگەر لە دەربڕین و شێوازدا کەموکورتییەك هەبێت، ئەوا بەتەواوی بۆ من دەگەڕێتەوە، ئەوەشی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) تەنها و تەنها جوانییە.

---

خۆشتردەویست." الترمذي، المناقب ٨ ـ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٢٨/٦ ـ البيهقي، الشعب الأيمان ١٥٠/٢.

## أ ـ له چاوەڕوانیی بەرەبەیاندا

جیهان شەوەزەنگێکی تاریك دایپۆشیبوو. شەوەزەنگێك لە هەگبەیدا نوورێکی چاوەڕوانکراوی هەڵگرتبوو. زایەڵەکانی ئاسۆ مزگێنی دەرکەوتن و هاتنی پێغەمبەرێکی نوێیان دەدا. شوێنکاری ئەم مژدانە لە ویژدانەکاندا هێندە زاڵبوو، ئەوەتا باس و خواسی دواهەمین پەیامبەر بۆتە بابەتی کۆڕ و دانیشتنی زۆرێك لە مەککەییەکان. ئامۆژگاری لەدووی ئامۆژگاری : " هەر کە ئەو پێغەمبەرە دەرکەوت زوو بگەنە لای و ئاوێتە بن لەگەڵ ڕۆحیدا." [1]

مرۆڤایەتی تێکڕا بەجارێك دڵی داخورپابوو. هەموو هیواکان وابەستە بووبوون بە دواهیینی فریادڕەسانەوە. دایکان وباوکان بە ئومێد بوون ئەم پێغەمبەرە لە نەوەی خۆیان بێت. هەرلەبەر ئەمەش بوو زۆرێکیان منداڵەکانیان ناودەنا "موحەممەد". [2]

بەڵام پێغەمبەری چاوەڕوانکراو، لە پشتی زنجیرەیەکی زێڕینەوە دەهات، کە لە حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە دەستی پێ دەکرد و بە عەبدولموتەللیب و عەبدوڵڵا کۆتایی پێ دەهات. بەڵێ دڵەکان لەم ڕێیەوە چاوەڕێی ئەو نوورەیان دەکرد. ڕووداوەکان هەواڵی هاتنی ئەویان دەدا. چڕبوونەوەی تاریکیش، نزیك بوونەوەی سپێدەیەکی ڕادەگەیاند کە تاریکی لەبن دەردەهێنا.

---

١ ـ بۆ نموونە بڕواننە: إبن سعد، الطبقات الکبری ١/١٦١-١٦٢ ـ الطبري، تأريخ الأمم و الملك ٥٢٩/١.

٢ ـ إبن سعد، الطبقات الکبری ١٦٩/١.

مرۆڤی ئەو سەردەمە لە هەموو ئەو مەبەستە مەزن و بەها بالآیانە مەحرووم بوو کە گیانیان بە بەر ژیاندا دەکرد و مانایان پێدەبەخشی، هەرچی کردە و کۆششیشیانە : ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا﴾ (النور: ٣٩) " ئەوانەی کە رێبازی کوفریان گرتۆتە بەر کردەوەکانیان وەک تراویلکە و سەرابێک وایە لە بیابانێکدا بریسکە بداتەوە، کەسێکی تینوو وا بزانێت ئاوە (بەتاڵوکە بۆی بچێت)، هەتا کاتێک گەیشتە لای دەبینێت هیچ نییە."

هەست و هزر و رەفتاریشیان زۆر جیاواز نەبوو لە وێنای ئەم ئایەتە :

﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَا﴾ (النور: ٤٠)

" یاخود (کردەوەیان) وەک چەندەها تاریکایی وایە کە لەناو دەریایەکی قوڵدا شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا، لە سەروشیەوە هەورێکی تاریک دایگرتبێت، تاریکاییەکان چین چین لەسەریەک نیشتبن، کاتێک دەستی دەربهێنێت خەریکە دەستی خۆی نەبینێت."

"جاهیلیەت" ناوی ئەم سەردەمە بوو، بەڵام ئەمە جاهیلیەتێك نییە کە پێچەوانەی زانست بێت، بەڵکو هاوواتای کوفرە و لە بنەڕەتدا دژی ئیمان و بیروباوەڕە. جا لێرەدا نامەوێت تابلۆ دزێو و قێزەونەکانی ئەو سەردەمەتان بخەمە پێشچاو، چونکە ـ ئەگەر چی بۆ کاتێکی کەمیش بێت ـ نامەوێت پەردەیەکی تاریك بە رووی رۆحتاندا بکێشم. ئەوەش ڕاستییەکە کە وێناکردنی باطل و کارە ناڕەواکان، زیهنەکان دەشێوێنێت و سازگاریی بیروهۆشەکان لێڵ دەکات، وە پێم وایە بوونە هۆکاری ئەمەش جۆرێکە لە تاوان. بەڵام سەرباری ئەمە، لێرەدا هەوڵ دەدەین ـ بە کورتی و لە چوارچێوەی چەند ئاماژەیەکدا ـ

تیشك بخەینە سەر هەندێك لە داب و نەریتەكانی ئەو ڕۆژگارە، تاوەكو دەركەوێت پێغەمبەری خوا(ﷺ) چ ڕەحمەتێكە بۆ تێكڕای بوونەوەران و ناردنیشی چ لوتفێكی ئیلاهییە.

بەڕاستی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) مەزنترین لوتفی پەروەردگار و فراوانترین چاكەیەتی بەسەر هەمووانەوە. هەربۆیە قورئانی پیرۆز لە ڕوانگەی ئاماژەكردن بۆ ئەم ڕاستییەوە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ (آل عمران: ١٦٤) " سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران كاتێک پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانە كردوون لە خۆیان ئایەتەكانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاک و پوخت دەكاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەكات."

جا بڕوانن بۆ لوتف و ڕەحمەتی خوای بالآدەست، كە لە نێو مرۆڤەكاندا و هەر لە خودی خۆیان پێغەمبەرێكی بۆ ناردوون كە سروشتی هاوشێوەی ئەوانە و هاوبەشییان دەكات لە تەرزی ژیاندا. دەبێتە پێشەوا و ڕێپیشاندەری ڕێگەی گەیشتنیان بە"حەق". ئەگەر پێوستیان بە پێشەوا بوو، ئەوا پێشیان دەكەوێت و ئەبێتە ئیمام و پێشەوایان. ئەگەر پێویستیشیان بە وتارێژ بوو، ئەوا سەردەكەوێتە سەر مینبەر و ڕەوانترین پەیامیان بەسەردا پەخش دەكات. هەر ئەو پێغەمبەرەش دەبێتە سەركردە و كاروباری سوپا بەڕێوەدەبات، لەم كارەشیدا هێندە لێهاتووە، بە تواناترین سەركردەكانی جەنگ لەدواوە بەجێ دەهێڵێت.

مەسیحییەكان بیروباوەڕێكی هەڵەیان هەیە. ئەوان باوەڕیان وایە كە خوای گەورە(سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ) قوربانی بە حەزرەتی عیسا(عَلَيۡهِٱلسَّلَامُ) داوە، بۆ ئەوەی ببێتە قۆچی یەكەمین هەڵەی مرۆڤایەتی. واتە باوەڕیان وایە كە خوای گەورە ـ

پاك وبێگەردیی بۆ خوا لەوەی ئەوان ئەیڵێن ـ قوربانی بە مەسیحی کوڕی خۆی داوە! بۆ ئەوەی چاوپۆشی لە هەموو مرۆڤایەتی بکات. بۆ ئەو مەبەستە و بەپێی ئەو بیروباوەڕە هەڵەیە مەسیح لە خاچ درا. بەم جۆرە چاوپۆشی کرا لەو یەکەم تاوانەی کە لە باوکە ئادەمەوە دەستپێدەکات و هەر مرۆڤێکیش کە دێتە دنیاوە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. ئەمە بیروباوەڕێکی هەڵە و گومڕایانەیە. وێڕای ئەمە ئاماژەیەکی ڕاستیشی تێدایە کە ئەویش ئەوەیە:

خوای میهرەبان بۆ ئەوەی لە ئادەمیزادەکان خۆش بێت و لە تاریکستانی نەفامی و گومڕایی و ئارەزووپەرستیدا بە تەنها بە جێیان نەهێڵێ، خۆشەویستترین بەندەی خۆی کە حەزرەتی موحەممەدە(ﷺ) وەك پێغەمبەر بۆ ڕەوانە کردن، سەرباری ئەوەی کە دەیزانی چ ئازار و دەردەسەرییەکی لەو پێناوەدا دێتە ڕێ. بەڵێ، خوای گەورە بەندەی خۆشەویستی خۆی بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی ڕەوانە کرد بۆ مرۆڤایەتی، تاوەکو سەرلێشێواوی نەبێتە چارەنووسیان و لە نێو گێژاوی بێ مەبەستیدا لەناو نەچن... تاوەکو بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی سەربکەون و هەریەکەیان ببن بە مرۆڤێکی کامڵ (الأنسان الکامل)... لە ناخیاندا ڕەهەندەکان تەی بکەن و هەموو ساتێك لە ڕۆحیاندا هەست بە مەزنی و چاودێری پەروەردگاریان بکەن. بە دەربڕینی شاعیری خواناس "ئیبراهیم حەققی"[1] ، پێویستە لەسەر ئیمانداران پەروەردگاریان وەکو گەنجینەیەك لە دڵەکانیاندا بناسن.

بەڵێ، دڵ گەنجینەیەکی بێ سنوورە، بەجۆرێك کە ئاسمانەکان و زەوی ناتوانان لە دەرکی ناوە جوان و سیفاتە بەرزەکانی خوای گەورەدا، کەچی ئەوە

---

١ـ شاعیر و زانا و گەشتیار و زاهیدێکی مەزنە. لە نێوان ساڵەکانی (١٧٠٣-١٧٨٠ ز)دا ژیاوە. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ناوی: "مەعریفەت نامە" و "گوڵدەستە"یە.

دڵە کە والآیە بە ڕووی ڕێژنەی تەجەللییاتی ناسین و دەرکی پەروەردگاریدا.

نە پەڕاوەکان، نە عەقڵ و هزر و فەلسەفەکان، نە ڕەوانبێژی و زمان پاراوی و، نە زەوی و ئاسمانەکان و نە بوونەوەران هیچیان نەیانتوانی بە تەواوی لە خوای گەورە(عَزَّوَجَلَّ) تێبگەن و حاڵی بن، بگرە کۆڵەوارن لە گوزارش کردن لە زاتی ئەو، تەنها دڵە کە ئەگەر بە پێوەرێکی بچووکیش بێت، دەتوانێ ببێتە تەرجومانی ئەو و پەی بە ناوە جوان و سیفەتە بەرز و پیرۆزەکانی ببات.

بەڵێ، دڵ زمانێکی ئەوتۆی هەیە کە گوێیەکان دەربڕینی وەك ئەویان نەبیستووە، ڕەوانبێژیی وێنەی ئەویان گوێ لێنەبووە. کەواتە پێویستە لەسەر مرۆڤ کە لە دڵی خۆیدا، دوورییەکان ببڕێت و هەر لەوێدا تینوێتی عەودالیی بشکێنێت. ئیتر لەوێ بگاتە خزمەت پەروەردگاری و لە خۆشەویستی ئەودا فەنا ببێت. جا خۆ ناردنی پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) هەر لەبەر ئەم مەبەستە بووە...

بەڵێ، ئامانج لە ناردنی سەرداری جیهانیان ئەوە بوو کە ئایەتەکانی خوای گەورە بەسەر خەڵکیدا بخوێنێتەوە و، موعجیزەکانی پەیتا پەیتا لە پێش چاوانیاندا پیشان بدات و ئاشنایان بکات بە ماهیەتی ڕاستەقینەی خۆیان. ئیدی لە سایەی ئەودا، مەردووم لە چڵکی سروشتی ئادەمیی پاڵفتە دەبوو و، بە ڕزگاربوونیشی لە زیندانی داخوازییە نزمە جەستەییەکانیشی، بەرەو پلەی ژیانی دڵ و ڕۆح بڵند دەبووەوە، لەڕاستیشدا هەر بەو جۆرە بڵند بووەوە.

بەڵێ، ئەو خەڵکی فێری کتێب و دانایی کرد. لەبەر نووری کتێب و ڕۆشنایی داناییدا مرۆڤایەتی خۆی دەدۆزێتەوە و، ئاوڕ لە دوارۆژی دەداتەوە.

ئیتر بەم جۆرە ڕێگەی بەختەوەری ژیانی هەتاهەتایی دەگرێتەبەر، بەڕاستیش ئەو ڕێگەیەی گرتەبەر.

لەناو ئێمەدا ڕۆژانی پیرۆز و گرنگ هەن. هەندێکیان بۆ ئیمانداران بە جەژن دادەنرێن. لە هەموو هەفتەیەکدا ئیمانداران خۆشی ڕۆژی هەینی دەچێژن. پێوەرەکە گەورەتر بکرێ لە جەژنی ڕەمەزان و قوربانیشدا لەم خۆشییەدا دەژین. لە جەژنی قورباندا، موسڵمانان قوربانیدانی حەزرەتی ئیبراهیمیان بیردەکەوێتەوە. پڕ بەدڵ و لە ناخیانەوە دەلاڵێنەوە لە خوا داوا دەکەن لێیان خۆش بێت. هەر لەبەر ئەمەشە هەندێکیان بە پرتاو ڕوو دەکەنە ماڵی خوا بۆ ئەوەی خۆیان بە پەردەکانیدا بسوون. کاتێکیش لە کێوی عەرەفاتدا دەوەستن، ڕووی دڵیان دەکەنە پەروەردگار و، بە گیانێکی موحەممەدییانەوە لێی دەلاڵێنەوە تا لێیان ببورێ و چاوپۆشییان لێ بکات.

جەژنی ڕەمەزانیش جەژنێکی گەورەیە و چەندەها واتای مەزنی لەخۆ گرتووە. چونکە کاتی نزیکبوونەوەی بەندەیە لە ڕەزامەندی خوای گەورە لە پاش مانگێك لە پەرستش. بەڵام جەژنێکی تر هەیە، کە جەژنە بۆ گشت مرۆڤایەتی، بگرە بۆ جیهانی بوونەوەران. ئەویش ئەو ڕۆژەیە کە دنیای پێ شەرەفمەند بوو بە هاتنی پێغەمبەری خوا(عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ). بەگوزارشتێکی دی، ڕۆژی "ویلادەتی ئەحمەدیە"یە. واتە ئەو ڕۆژەی خوای گەورە نووری ئەحمەدی هەڵکرد و چرای موحەممەدی لە ئاسمانی مرۆڤایەتیدا وەك ڕۆژی ڕووناك درەوشاندەوە. ئیتر بەم نوورە، تاریکایی نەفامی ڕەوییەوە و، نوور و ڕۆشنایی هەموو جیهانی داپۆشی. بەڵێ، ئا ئەمە مەزنترین نیعمەت و بەخشایشی خوای گەورەیە بۆ ئینس و جین.

## ب ـ سەردەمێكی تاریك

هەر سەردەمێك بیروباوەڕی یەكتاپەرستیی تێدا لەق ببێت، سەردەمێكی تاریكە. چونكە بالادەست نەبوونی باوەڕ بە خوا، كە نووری ئاسمانەكان و زەمینە لە سەرجەم دەروونەكاندا، ڕۆح و ویژدانەكان ڕەش و تاریك دەكات. جا لەبەر ئەوەی چۆنییەتی ڕوانینی ئەم جۆرە دڵ و ویژدانە بۆ شتان و ڕووداوەكان تووشی لێڵی و كورت بینی دەبێت، ئیتر ئەو مرۆڤە لە دنیایەكی تاریكدا، بۆ هەمیشە وەك شەمشەمەكوێرە دەژی.

لەوەها سەردەمێكدا كە دین بە هەموو پایەكانییەوە كەوتبووە لەرزە و، پەیامە ئاسمانیەكانیش لەلایەن شوێنكەوتوانیانەوە دەسكاری كرابوون، چەند كەسێكی كەم مابوون یەكتاپەرست بن و ئیمانیان بە خوا هەبێ. بەلام وەنەبێ ئەوانیش ئەو زاتە بە سیفەت و ناوە جوانەكانییەوە بناسن. هەر بۆیە نەیان دەزانی چۆن ئەركی بەندایەتی بۆ ئەو خوایە ئەنجام بدەن.[1]

### ١ ـ بت پەرستیی سەردەمی نەفامی

موشریكەكان ئەو بتانەیان دەپەرست كە ناوەوە و دەرەوەی كەعبەیان لێ پڕكردبوو. شانازیان بەو پەرستنەوە دەكرد و دڵی خۆیان پێ خۆش دەكرد. ئەوانەشیان كە زانستێكی كەمیان هەبوو، دەیانوت ئێمە تەنیا وەك هۆكارێك بۆ نزیك بوونەوە لە خوا ئەو بتانە دەپەرستین. قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی خۆیان ئاماژە بۆ ئەم وتەیەیان دەكات و، دەفەرموێ: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ (الزمر: ٣) " ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوە نەبێت كە لە خوا نزیكمان بخەنەوە."

---

١ - إبن كثير، البداية و النهاية ٢٣٨/٢.

بەم شێوەیە هەستی بەندایەتی ـ کە وەك سپاردەیەکی گرنگ بە فیترەتی مرۆڤ سپێردراوە ـ ناپاکیی لەگەڵدا کرا و خراپ بەکارهێنرا. باشە کەی گونجاوە بەرد و دار و گڵ و خۆر و مانگ و ئەستێرەکان، بپەرسترێن؟ خۆ بەمەشەوە نەوەستابوون، کار گەیشتبووە ئەوەی هەندێك خواردنی وەك شیرینی و پەنیر، کە بەدەستی خۆیان دروستیان دەکرد، دەیانپەرستن و کاتێکیش برسییان دەبوو دەیانخواردن!

قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ نمونەی ئەم جۆرە بیرکردنەوە پووچ و تێگەیشتنە ڕزیوانە دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾

(یونس: ١٨) " بێ باوەڕان و خوانەناسان شتێک دەپەرستن لەجیاتی خوا نە زیانیان پێدەگەیەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکاکارمانن لای خوا، پێیان بڵێ ئەی موحەممەد باشە ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەنەوە لە شتێک کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبێت و خوا نەیزانێت؟! (خوای گەورە) پاک و بێگەرد و بەرز و بڵندە لەوەی کە نەفامان دەیکەن بە هاوەڵی."

هەروەها ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴾ (الزمر:٣)

" ئاگاداربن، دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی تر و شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە لە خوا نزیکمان بخەنەوە. بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیە و ڕایان

دەربارەی جۆراو جۆرە. بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕە چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن."

ئینجا هەر خۆیان لەدووی بیانوویەك دەگەڕێن بۆ ئەم بیروبۆچوونە لار و لەوێرەیان و، شوێنکەوتەیی باوباپیرانیان دەخەنە پێش چاو: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾ (البقرة: ١٧٠)

" ئەگەر بەو خەڵکە نادانە بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە باو و باپیرانمان پێوەی ئالوودە بوون و لەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باو و باپیرانیشیان تێ نەگەیشتوو هیچ نەزان و ناشارەزا و ڕێنموویش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەکەون)؟! "

## ٢ ـ خونچەکان زیندەبەچاڵ دەکران

قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ خراپە و بەدڕەفتارییەکی تری سەردەمی نەفامیی دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ۝ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ (النحل: ٥٨-٥٩) " خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێک لەو نەفامانە، ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە... لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها (بیر دەکاتەوە): ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە؟! ئای چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!! "

بەڵێ، هەرکات یەکێکیان مزگێنی ئەوەی بدرایەتێ کە کچی بووە، یەکسەر دەموچاوی توڕەیی لێ دەنیشت و ڕەش هەڵدەگەڕا. لەتاو ئەو مژدە ناخۆشە، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد بچێتە ناو خەڵکی. هەواڵەکەی هێندە بەلاوە سەخت بوو، حەزی دەکرد خۆی لە چاوی خەڵکی تەرە بکات و بچێتە کونێکەوە و خۆی حەشار بدات. ئیتر دەکەوتە دڵەڕاوکێ و نەیدەتوانی بڕیار بدات. بەم جۆرە خۆی بە ناچار دەزانی یەکێك لەم دوو ڕێگەیە بگرێتە بەر:

یان ئەوەتا کچەکەی لە ژیاندا دەهێڵێتەوە و بەرگەی ئەو شەرمەزارییە دەگرێت کە لە کۆمەڵگەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، یاخود لەپێناو پاککردنەوەی شەرەفیدا(!) کیژۆڵەکەی زیندەبەچاڵ دەکات.

ئیدی هەروەك دەبینن ئافرەت لە سەردەمی نەفامیدا تا ئەو ڕادەیە بێ ئەرزش بووە. جا وەنەبێ ئەم سووکایەتی کردن و بە کەم سەیرکردنەی ئافرەت، تەنها لە کۆمەڵگەی عەرەبی سەردەمی نەفامیدا بوویێت، بەڵکو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم و فارسیشدا هەمان زیهنیەت بەربڵاو بووە. بۆیە دەکرێ بڵێین: ئەو شۆڕشە مەزن و، گۆڕانکارییە ڕیشەییەی ئیسلام لە نێو عەرەبی سەردەمی جاهیلیدا سەبارەت بە دۆزی ئافرەت بەرپای کرد، لە هەمان کاتدا دەستکەوتێکە بۆ تێکڕای ئافرەتانی جیهان و، کردەیەکە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوشێوەی نییە.

بەڵێ، بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆز بەر بە ئاوەها دڕندەییەك دەگرێت و لەبەر هەر هۆیەك و بە هەر شێوەیەك بێت، کوشتنی منداڵان قەدەغە دەکات: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ (الانعام:١٥١) " منداڵانی خۆتان لەبەر برسێتی و نەداری مەکوژن، چونکە ئێمە (پەکتان ناخەین) ڕزق و ڕۆزی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین."

هەروەك خوای گەورە پێیان بفەرموێ: بۆ منداڵەکانتان دەکوژن؟ من خۆم ڕۆزی ئێوە و ئەوانیش دەدەم. مەگەر نابینن کە سەر زەوی پڕیەتی لە هەزارەها سفرە و خوانی ڕازاوەی جۆراوجۆر بۆتان؟ نابینن کە ئاسمان دائەچلەکێ بۆ فریاکەوتنتان. ڕەو بە هەورەکانی ئاسمانیش دەکرێت بۆ ئەوەی بەفرو بارانتان بەسەردا ببارێنن؟ ئەم ملیۆنەها ڕووەکە جۆراوجۆرەی سەر ڕووی زەوی، جگە لە من کێ ڕواندوونی؟ لەکاتێکدا ئەم هەموو شتانە دەبینن، ئەی چ ئەقڵ و ژیری و فام و ویژدانێك واتان لێدەکات لە ڕزق و ڕۆزی خۆتان بترسن، بە ڕادەیەك دەستتان بچێتە کوشتنی منداڵەکانتانەوە؟ قەت لەبیرتان نەچێ ئەوەی دەستی دەچێتە ئەم تاوانەوە، هەرگیز نابێتە مرۆڤێك شیاو و شایستەی ئەوە بێ خوای گەورە گوفتاری لەگەڵدا بکات. بەڵکو خوای گەورە ئەم بێتاوانانە ئەدوێنێ و لێیان دەپرسێ: ئاخۆ چ گوناهێکتان کردبوو ئاوا لەسەری کوژران. ستەمکاران لەسەر ئەنجامدانی ئەو ستەمە قێزەونە بەتۆڵەی دادپەروەرانەی خۆیان دەگەن. ئـــایەتە پیرۆزەکەش دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ﴾ (التكوير: ٨-٩) " کاتێک کچی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێدەکرێت، بە چ گوناهێک، بە چ تۆمەتێک کوژرا؟! " بە شێوازێکی ئەوتۆ بۆمان باس دەکات کە ڕەفتار و نەریتی ئەو سەردەمە موچڕك بە لەشدا دەهێنێت.

ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵان ئەم دیمەنە دڕندانەیەی سەردەمی نەفامی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە و، وتی: " ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا کیژۆڵەکانی خۆمان زیندە بەچاڵ دەکرد. ئێمەش تازە کچێکمان بووبوو. کچەکەمان مایەوە تا زەمانی پژا. ئەوجا ڕۆژێکیان بە دایکیم وت: بیگۆڕە دەیبەم بۆ ماڵی خاڵی. دایکە بێچارەکەی دەیزانی کە مانای ئەم قسەیە چییە. منداڵە

خۆشەویستەکەی، جگەرگۆشەکەی، پاش نەختێکی تر فڕێ دەدرێتە ناو چاڵێکەوە و پاش پەلەقاژەیەکی کەم گیان دەسپێرێت. بەڵام ئافرەت مافی ئەوەی نەبوو پێش بەوەها کارێ بگرێ. تاکە شتێك کە دەیتوانی بیکات ئەوە بوو پڕ بەدڵ و لە ناخەوە بگری و فرمێسك بڕێژێ. هاوسەرەکەم ئەوەی کە پێم وتبوو جێبەجێی کرد. منداڵەکەش هەر بەڕاست وای دەزانی بۆ ماڵی خاڵی دەچێت، بۆیە لە خۆشیدا بازبازێن و یاری دەکرد. بەڵام شوێنی مەبەست ماڵی خاڵی نەبوو، بەڵکو ئەو چاڵە بوو کە پێشتر بۆم هەڵکەندبوو و دەبووە گڵکۆی نادیاری. کە گەیشتینە لێواری چاڵەکە، بە کچەکەمم وت کە تەماشایەکی ناو چاڵەکە بکات. ئیدی هەر کە سەری نەوی کردەوە، منیش کێشام بە پشتیدا و لەناو چاڵەکەدا گرمۆڵەم کرد. کەچی ئەو هەر هەوڵی دەدا بە قەراغی چاڵەکەدا وەرگەڕێت و بێتە دەرەوە. لەلایەکەوە پەلەقاژەی دەکرد و لەلایەکی تریشەوە دەیووت 'بابە گیان، تۆزاوی بوویت.' دەیویست بمتەکێنێت، بەڵام من دانەیەکی ترم پیا کێشا و لەو بیابانە چۆڵەدا بەزیندوویی کردم بەژێر خاکەوە." کاتێك ئەو پیاوە ئەم ڕووداوەی دەگێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی لە دەوری دانیشتبوون هەنسکی گریانیان پێ ڕانەدەگیرا. یەکێك لە هاوەڵان وتی: " کابرا، پێغەمبەرت خەمبار کرد." کەچی ئازیز و سەروەرمان فەرمووی: " جارێکی تریش بیگێڕەوە." ئەویش دیسانەوە بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە. پێغەمبەری خواش دووبارە گریا، تاکو فرمێسك ڕیشی پیرۆزیانی تەڕکرد." [1] وەك بڵێی بە دووبارە کردنەوەی ئەم بەسەرهاتە، پێغەمبەر(ﷺ) دەویست ئەم پەیامە بگەیەنێت: " ئێوە پێش ئیسلام ئەمە حاڵتان بوو. بۆیە ئەم ڕووداوەشم پێ دووبارە کردەوە، تا ئەو بەها مرۆییانەتان

---

١ - الدارمي، المقدمة ١.

یاد بخەمەوە کە ئیسلام خەڵاتی کردوون."

وەك لەم نموونە دڵتەزێنەوە دەردەکەوێت، مرۆڤی ئەو سەردەمە لەنێو سەرگەردانییەکی ناهەمواردا ژیاوە. لەگەڵ هەزارەها ڕووداوی جەرگبڕی تر، لە تاریکی هەموو ڕۆژگارەکانی ئەو بیابانەدا چەندین چاڵی قووڵ و گەورە هەڵدەکەنران و، چەندین منداڵی بێ تاوانی تێ فڕێ ئەدرا تا لەوێدا بمرن. بەڵێ مرۆڤایەتی لە دڕندەیی و وەحشیگەریدا پێشی کەمتیارە دڕندەکانی دابووەوە. ئەوەی کەڵبە و چڕنوکی نەبوایە دەبووە نێچیر و لەلایەن خاوەن کەڵبە و چڕنوکەکانەوە لەناودەبرا. کۆمەڵگەش لەو کاتەدا بەدەست چەندەها کارەساتی سەختەوە دەتلایەوە، کەسێکیش نەبوو لە ڕووی ئەو هەموو پەرێشانی و نەهامەتییانەدا بوەستێتەوە و، بڵێ: " ئیدی بەسە"

ئا لەم کاتانەدا بوو کە مایەی بەدیهێنانی بوونەوەران(ﷺ) خۆی لە خەڵکی دەکێشایەوە و لە ئەشکەوتی "حیرا"دا دەچووە خەڵوەتەوە - لەوەدوا ئوممەتەکەی، بەو چیایەیان دەوت "چیای نوور" - چاوی دەبڕییە ئاسۆکان و چاوەڕوانی بەرەبەیانی ڕزگاریی دەکرد. پێدەچێ ئەو زاتە بۆ ماوەیەکی زۆر سەری لەسەر زەوی دانابێ و لە پەروەردگاری پاڕابێتەوە بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی. داوای کردبێ کە فریادڕەسێکی بۆ بنێرێت. هەر بۆیە کاتێك ئیمامی بوخاری و موسلیم باسی ئەو سەردەمە دەگێڕنەوە زاراوەی " فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ" بەکار دەهێنن. ئەم زاراوەیە واتە لەخەڵك دوور دەکەوتەوە و خۆی تەرخان دەکرد بۆ پەرستش.

بەڵێ، پێغەمبەر(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) هەندێ جار لەوێ دەمایەوە تا هەگبەی خۆراکیشی تەواو نەبووایە، نەدەگەڕایەوە بۆ مەککە. پاشان خۆراکی پێویستی

لەگەڵ خۆی دەبرد و جارێکی تر ئەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە.[1]

بەڵێ، ئەو لە لایەکەوە سەرقاڵی ڕامان بوو لە ڕاستییەکانی بوون و نهێنیەکانی ئەودیو پەردەی بوون و ئامانجی بەدیهێنان، لە لایەکی تریشەوە لە بیری سەرگەردانیی مرۆڤایەتی و حاڵی پەژموردەی ئەودا بوو.

## ٣ ـ بەها باڵاکان گۆڕابوون

کۆمەڵگە بەرەو شێوێکی قووڵ و تاریك تلۆر دەبووەوە. چونکە لەو کۆمەڵگەیەدا هەموو بەها مرۆییەکان ئاوەژوو کرابوونەوە. چاکە بووبووە نەنگی، نەنگی و کەمیش بووبووە چاکەو شانازی. دڕندەیی ڕێزی لێدەگیرا و، بەزەیی و مرۆڤ دۆستیش بێ ڕێز سەیر دەکرا. گورگەکان جێگەی شوانەکانیان گرتبووەوە و فیزیان لێدەدا، مەڕەکانیش کە هیچ هێز و دەسەڵاتێکیان نەبوو، لە ژێردەستی ئەو شوانە بێ بەزەییانەدا ئێش و ئازاریان دەچەشت. بەدڕەوشتی و خۆدامالین لە بەهاکان هێندە تەشەنەی کردبوو، زۆر کەس هەبوون نەیاندەزانی باوکیان کێیە. ڕەچەڵەك و نەژاد لە ڕەگەوە وشك بووبوو و لەناویاندا باری کردبوو. قوماربازی و مەی نۆشی نەنگی نەبوون. پاوانکردنیش شتێکی زۆر ئاسایی بوو. هەرچی شێواز و هونەری دەست بڕین و مژینی خوێنی خەڵکیشە، بەکارێکی زیرەکانە و ئازایەتی لەقەڵەم دەدرا.

ئیدی دوای ئەم هەمووە، زۆر پێویست بوو کە کەسێکی " گفت ئیکسیر" بێتە مەیدان و بەرووی هەموو ئەم دارمانە ئەخلاقییانەدا بڵێت: "بوەستە!" پێویستییەکە ئەوەندە زۆر بوو، گەیشتە ئاستێك بەزەیی خوای گەورە

١ - البخاري، بدء الوحي ٣ ـ مسلم، الأيمان ٢٥٢.

بجولێنێت. خوای میهرەبانیش هات بە دەم ئەم پێداویستییەوە و، فەخری کائیناتی بۆ ناردن و، کردیە فرستادە و پێغەمبەری خۆی. بە تەشریف هێنانی ئەو، هەموو شتێك گۆڕا. بەڵێ شاعیری مەزن " ئەحمەد شەوقی" ڕاستی وتووە کە دەڵێت:

وُلِدَ الْهُدَى فَالْكَائِنَاتُ ضِيَاءُ        وَ فَمُ الزَّمَانِ تَبَسُّمٌ وَثَنَاءُ

" ڕێنوێن هاتە دنیا و ڕووناك بوونەوە بوونەوەران
هەر بەخەندە و پێزانینە دەم و زاری ڕۆژ و زەمان "

دوای ئەوەی کە کات و شوێن ( الزمان و المكان) نوقمی تاریکی بوو‌بوون، بەو نوورەی کە حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) هێنای، هەروەك چەپکە گوڵێکی دەم بە خەندەیان لێهاتوو و، پاش چەندینساڵیش لە دەمی هیجرەتدا خەڵکی مەدینە لە پێشوازی ئەودا:

طَلَعَ الْبَدْرُ عَلَيْنَا        مِنْ ثَنِيَّاتِ الْوَدَاع
وَجَبَ الشُّكْرُ عَلَيْنا        مَا دَعَا لِلهِ دَاعٍ[1]

" وا مانگی تابان هەڵهات        لە ثەنیاتی وەداعەوە
شوکرانە واجبە لەسەرمان        تا ناوی خودا دەنگ بداتەوە." [2]

دەوتەوە و، لەگەڵ دەربڕینی هەموو ئەم هەستانەدا بەخێرهاتنیان دەکرد. بەڵێ، ئیدی ئەو سیما بێگەردانە بە زاری خاوێنیان ئەم بەستە پڕ واتایانەیان دەچڕی.

---

١- إبن كثير، البداية و النهاية ١٩٧/٣، ٢٣/٥ ـ إبن حجر، الفتح الباري ١٢٩/٨.

## ج ـ بەر لە پێغەمبەرایەتیش وەك پێغەمبەرێك ژیاوە

### ١ـ دەست پاكی

ئەگەر سەرنجێك لە سیرەی بۆنخۆشی حەزرەتی موستەفا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بدەین، دەبینین كە هەموو قۆناغەكانی منداڵی و لاوی و پێگەیشتنی، وەك پێشەكی و پلیكانە، ڕێخۆشكەر بوون بۆ قۆناغی پێغەمبەرایەتییەكەی. بەڕادەیەك كاتێ پەیامەكەی ڕاگەیاند، زۆرێك لەوانەی كە دەیانناسی دەستبەجێ ئیمانیان پێی هێنا.

ئەو ڕاستگۆیەی كە هیچ كات وتەیەكی درۆی لێ نەبیستراوە، ئێستا لەبارەی خواوە قسەدەكات و دەڵێ نێرراوی خوام. جا چۆن دەگونجێ مرۆڤێك تاكە درۆیەكی لە بچوكترین ئیش وكاریدا نەكردبێ، ئێستا درۆ لە بابەتێكی وەها مەزن و گرنگدا بكات و ئەو كارەش پەیوەندی بە خواوە هەبێت؟ [1] ئەمە شتێكی مەحاڵە. بەڵێ، ئەمە بیركردنەوەی مرۆڤی ئەو سەردەمە بوو. گەر هەمووشیان نەبێت، ئەوانەیان كە عینادی و حەسوودییان وەلا نابوو، زوو بەزوو ئیمانیان پێ دەهێنا .

ڕاستە ئەو سەردەمەی ئەوی تێدا دەژیا سەردەمی نەفامی بوو. بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییە لای هەمووان ڕوون بێت كە ئەم پەسن و ناساندنە، ناوێك بوو لە ژیانی ئەو كەسانە نرابوو كە لە دەرەوەی زەمەنە تایبەتییەكەی ئەودا دەژیان. دەنا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرگیز لە نەفامیدا نەژیاوە. ئەو كەسێكی ئەمین بوو، هەموانیش بەم سیفەتەوە دەیانناسی. بۆ نموونە دەتەوێ بۆ

---

١ - البخاري، بدء الوحي ٣.

گەشتێك بڕۆیت و بەنیازیت تا دەگەڕێیتەوە خێزانەکەت بەکەسێکی ئەمین بسپێری. بەبێ دوودڵی ئەتوانی لای موحەممەدی ئەمین بەجێی بهێڵیت و، دڵنیابیت لەوەی تا کاتی گەڕانەوەت چاو بەرز ناکاتەوە تاکو بۆی بڕوانێت. ئەگەر پێت خۆش بوو ماڵ و سامانەکەت لای کەسێك دابنێیت، ئەوا یەك سات تووشی دڵەڕاوکێ نابیت لەوەی بچیت ماڵەکەتی پێ بسپێری و، دڵنیابیت کە تۆسقاڵێکی تووشی زیان نایەت و بەچاکترین شێوە بۆتی دەپارێزێ. ئەگەر ویستت شتێکت بەتەواوی و بە یەقینی لە هەر کاروبارێکدا بۆ دەرکەوێت و ڕاوێژ بە کەسێك بکەی، ئەوکات ئەبێ بە زوویی خۆت بگەیەنیتە ڕاستگۆی ئەمین، بۆ ئەوەی گوێی لێ بگری و بابەتەکە لەبەر ڕووناکی وتەکانی ئەودا هەڵبسەنگێنیت. چونکە لە ژیانیدا تەنها درۆیەکیش چییە، بەدەمیدا نەهاتووە.

ئایا بەڵگەت لەسەر ئەمە دەوێ ؟ زۆرباشە:

ئەوەتا سەرئەکەوێتە سەر گردی "صفا" و لە خەڵکەکەی دەوروبەری دەپرسێت: " ئەگەر هەواڵتان بدەمێ کە کۆمەڵێك سوارە و شەڕکەر لە پەنای ئەو شاخەدان و خەریکە هێرشتان بۆ دێنن، ئایا بڕوام پێ دەکەن؟ " هەموویان بە یەك دەنگ وتیان: " بەڵێ بڕوات پێ دەکەین، چونکە هەرگیز درۆمان لێ نەبیستوی." [1] لەنێو ئەو خەڵکەدا دوژمنانی دینی وەك ئەبوو لەهەبیش هەبوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان تەصدیقی ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوایان کرد و، دانیان نا بە ئەمینی و ڕاستڕەوییەکەیدا.

ئەو دەمەی لە سکی دایکیدا بوو، باوکی کۆچی دوایی کرد. کە تەمەنی

---

١ - البخاري، تفسير(سورة المسد) ١-٢ ـ مسلم، الأيمان ٣٥٥-٣٥٦.

گەیشتە شەش ساڵان، دایکیشی وەفاتی کرد. ئەوجا عەبدولموتەلیبی باپیری بردییە لای خۆی. کاتێك بووە هەشت ساڵان، باپیریشی مرد. هەروەك بڵێی قەدەر لە هەموو شتێك دایدەماڵی و سازی دەکرد تاکو هەموو کار و فەرمانەکانی بە خوای گەورە بسپێرێ. هەرکەسێك پارێزگاری و سەرپەرشتی کردنی ئەوی بگرتایەتە ئەستۆ، زوو بە زوو ماڵئاوایی لە ژیان دەکرد. وەك بڵێی بە دەرکەوتنی نهێنی ئەحەددیەت لە دووتوێی نووری تەوحیددا، ڕاستەوخۆ و بە کردەیی چاودێری و پارێزگاریی خوای گەورەی بیردەخرایەوە.

بەڵێ، ئەو دەبوو " کەلیمەی تەوحید" و ڕستەی "حسبنا الله" هەر لە دەسپێکی ژیانیەوە بکاتە ویردی زمانی و لە قووڵایی ویژدانیدا هەست بە واتاکانی بکات. هەربۆیە پێویست بوو هۆکارە ڕواڵەتییەکان تێکڕا بە جارێك دەست بکێشنە دواوە و لەکار بکەون. جا هەر واش بوو...

"عبدالله" کە بە واتای بەندەی خوا دێت و، "ئامینە"ش کە بە مانای ئافرەتی ڕاسپاردەناس و دروست دەهات، ناوی ئەو باوك و دایکە بەڕێزە بوون کە بوونە هۆکاری هاتنە دنیای سەروەرمان. بەڵێ، ئەو لە دایکێکەوە هاتبووە دنیا کە سەرچاوە و ئەمینداری ئەمنیەت بوو. ناوی باوکی ئەم زاتەش(ﷺ) ـ کە بەر لە پێغەمبەرایەتیش سەرفراز بوو بە بەندەگی ـ واتای بەندەی خوای دەگەیاند. هەڵبەت هیچ کام لەمانە ڕێککەوت و لە خۆوە نەبوون، بەڵکو بە گوێرەی نەخشەسازی و تەقدیری ئیلاهی ڕوویانداوە.

## ٢ ـ بەبێ دایك و باوك گەورە بوو

ئەو بەبێ دایك و باوك گەورە بوو. کۆڵێکی قورس و فەرمانبەرییەکی زۆر گرنگ چاوەڕێی دەکرد. بۆیە دەبوو هەر لە سەرەتاوە خۆی بۆ ئامادە بکات.

دەبوایە بگاتە چڵەپۆپەی تەوەککول و، ئامادەباش بێ بۆ ڕوویەڕوو بوونـەوەی هەموو کێشەکان. ئەوەتا خوای گەورە پاراستی لە دەوڵەمەندییـەکی زۆر کـە بەرەو خۆ بەزل زانیی ببات. هەروەك چۆن بەدووریشی گـرت لـە هەژاریـەکی ڕسواکەر کە تووشـی کەساسـی و زەبـوونی بکـات.خوای گـەورە خـۆی بـە مرۆڤێکی مامناوەند و ڕاستڕەو دروستی کـردووە و لـە گشـت قۆناغـەکانی ژیانیدا لە زیادەڕەوی و کورتبڕی (الافراط و التفریط) پاراستوویەتی.

زۆر گرنگە بۆ پێشەوایەك بـەم جـۆرە ڕۆژگـارە ناهەموارانـەدا تێپـەڕێ. پێویسـت بـوو مانـای هـەتیویی زۆر بـە باشـی تێبگـات، تـاکو لەگـەڵ بەردەستەکانیدا وەك باوکێکی بەسۆز و دلۆڤان ڕەفتار بکات. هەرکەسیش بێ دایك و باوکیی چەشتبێ، دەتوانێ ببێتە باوکێکی بـە بـەزەیی و بەسـۆز بـۆ نەتەوەکەی. هەروەها پێویست بوو تامی هەژاری و نەداریش بچێژێ، تـاوەکو هەست بە گیروگرفتی ئەوانە بکات کە هەڵدەسێ بە بەڕێوەبردنی لایەنـەکانی ژیانیان. بەم جۆرە خووڕەوشتی یارمەتیدانی هـەژارە بـێ نـەواکان و دەسـت هێنان بەسەریاندا و، بەخێوکردنیان و بایەخ پێدانیان، لـەو ئاکـارە بەرزانـەی پێغەمبەری خوا بوون، کە ڕەگ و ڕیشەیان دەگەڕایەوە بۆ ئەم قۆناغەی ژیانی. بەڵێ، ئـەو خـۆی چـاك هـەتیویی چەشـتبوو، لـەو ئـاوەی نـۆش کردبـوو و هەواکەشی هەڵمژیبوو. بۆیە تەنانەت کاتێکیش گەیشتە لوتکە، دەستبەرداری ئەم خووڕەوشتە جوانانە نەبوو و، ئەو ژیانە ساکارەی هەروا مایەوە.

لەهەموو ژیانیدا دڵی هەتیوێکی نەڕەنجاندووە، هەر کەسێك داوای شتێکی لێکردبێ، دەستی بە ڕوویدا نەناوە و تەریقی نەکردووەتەوە. چونکە پەروەردگاری فێری ئەم ڕەوشتە جوانەی کردووە و لەسەر ئەم ئاکارە پەروەردەی کردووە: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ۝ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ۝ وَوَجَدَكَ عَائِلًا

فَأَغْنَىٰ ۝ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ۝ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ۝ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ [الضحى: ٦-١١) " ئايا پەروەردگارت نەیبینیت بە هەتیوی و خێرا دەرووی لێکردیتەوە و لانەی بۆ سازاندیت؟! ئەی لە حەیرەتدا نەبوویت و، هیدایەتی دایت؟! ئەی نەیبینیت هەژاریت و دەوڵەمەندی کردیت؟! کەواتە تۆش (ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار) هەتیو مەچەوسێنەرەوە. دڵی سواڵکەر مەڕەنجێنە. (بەڵکو) دەربارەی ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و باسیان بکە."

هەر کاتێ ئەم سورەتە دەخوێنمەوە، بێ باوکیی خۆم ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە باوکم چەندین ساڵە وەفاتی کردووە ـ لە حزووری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەك شەفاعەتکارێك دەردەبڕم و، بەو ئومێدەی منیش لەبەر دەرگاکەی وەدەر نەنێ، عەرزی حاڵم دەکەم و، دەڵێم: " وا ئەمەش هەتیوێك لەبەر دەرگاکەتدا! چی دەبێ، لەبەر دەرگاکەت دەری مەکە."

## أ ـ لەلای عەبدولموتەلیب

دەمێك بوو باپیری نووری پێغەمبەرایەتیی تیا بەدی کردبوو. چونکە هەموو ئەو ڕۆژانەی لەگەڵیدا دەژیا، ڕۆژانی پڕ پیت و بەرەکەت بوون. ئەوەتا لەگەڵ خۆیدا بۆ کۆڕی پیاوماقوڵانی دەبرد و، ڕێزی شایستەی لێدەنا.[1] دوور نییە ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەناوچاوانیدا بەدی کردبێ. چونکە لە نیگا و ڕوانینەکانی پێغەمبەری خوادا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هێندە ئاماژەی قووڵ و ناوەڕۆکی واتادار هەبوون، ئەستەمە لە یەکێکی تردا بوونیان هەبێت.

---

١ - إبن هشام، السيرة النبوية ١/١٢٧.

لەوانەشە ئەو هەواڵانەی لە "لوئەی"ەوە بیستبێ، کە یەکێکە لە باپیرەکانی و لەبارەی دەرکەوتنی پێغەمبەرێك لەنەوەی خۆیەوە گێڕاویەتەوە. پێدەچێ بەهۆی ئەم مزگێنییەوە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیی تێدا بەدی کردبێ و ئەمە بووبێتە هۆکاری ئەو هەموو خۆشەویستی و هۆگرییەی هەیبووە بۆ کوڕەزاکەی. بەڕادەیەك کە غیرەی لەچاوی خۆشی دەکرد بەرامبەری. ئەم پیاوە مەزنە، کاتێك وادەی مەرگی هاتە پێش، زۆر غەمگین بوو و بەکوڵ دەگریا. چونکە ئیتر نەیدەتوانی موحەممەدەکەی لە ئامێز بگرێ و بیگوشی بەخۆیەوە. بڕوانن، ئەو پیاوەی لە هێرشی سوپای "ئەبرەهە"دا بۆ سەر شاری مەککە چاوی نەتروکاند و، لە جەنگی "فیجار"یشدا، کە جەنگێکی چەند ساڵە بوو دژی چەندین خێڵ، چاوەکانی ئەسرینێکیان نەڕژاند. کەچی ئێستاکە ئەم پیاوە گەورەیە هەروەك منداڵێکی بچووك لەتاو دوا ساتەکانی جێهێشتنی کوڕەزا بەختەوەرەکەیدا بە کوڵ دەگری. بەم شێوەیە بە مردن وماڵئاوایی کردنی لە ژیان، سەرپەرشتی و پارێزگاریی عەبدولموتەلیب کۆتایی هات. دەبوایە گەوهەر و مرواری بوونەوەران بدرێتە دەستی "ئەبوو تالیب"ی مامی.

### ب ـ ڕۆشتنی بۆ لای ئەبوو تالیب

ئەبوو تالیبی مامیشی پەیمانەکەی خۆی بردە سەر. نزیکەی چل ساڵ پێغەمبەری خوای گرتە خۆی و بوو بە پاڵپشت و یارمەتیدەری. بەڵام ئەم چاکەیەی بێ بەرامبەر نەمایەوە. چونکە خوای گەورە کوڕێکی وەك ئیمامی عەلی(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) پێ بەخشی. ئەمە جگە لەوەی کە نەوەی هەر پێغەمبەرێك لە پشتی خۆی دەبێت، کەچی نەوە و وەچەی پێغەمبەری سەروەرمان لەڕێگەی حەزرەتی عەلییەوە بەردەوام دەبوو. لەمبارەیشەوە ڕیوایەتێك لە

پێغەمبەرمانەوە هاتووە.[1]

حەزرەتی عەلی نوێنەری لایەنی ویلایەتی پێغەمبەری خوا بوو. لەم ڕووەوە ئەو بە گەورە و سەرتاجی هەموو ئەولیاکان دەژمێررێت. تاکو ڕۆژی قیامەتیش خواناسان و شوێنکەوتووانی هەموو تەریقەتەکان زۆر بە ڕێز و شکۆوە یادی ئیمام دەکەن و شوێنی دەکەون. حەزرەتی عەلی ـ کە شاهی مەردان و حەیدەری کەڕار و زاوای پێغەمبەرە ـ وەك بڵێی خەڵاتی خوای گەورە بوو بۆ ئەبوو تالیب، لە پاداشتی ئەو چاکانەی بەرامبەر پێغەمبەری خوا نواندی.

ئەبوو تالیبیش هەروەك عبدولموتەلیبی باوکی تەنها هۆکارێکی ڕواڵەتی بوو. دەنا خوای گەورە(سُبۡحَانَهُۥوَتَعَالَىٰ) خۆی پارێزەر و چاودێری ڕاستەقینەی ئەو بوو، خۆی سەروکاری دەکرد و فەرامۆشی نەدەکرد.

لەکاتێکدا خوای گەورە ئەم کەسایەتیە ناوازەیەی بەرز دەکردەوە بۆ پلە و مەقامی نبووەت، کۆمەڵگەشی ئامادە دەکرد بۆ وەرگرتن و قبووڵ کردنی ئەو پێغەمبەرە. ڕۆژ دوای ڕۆژ نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی خۆریان لەسەر هەڵدەهات و ئاشکرا دەبوون. تا ئەوەی حەزرەتی موحەممەد(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) بوو بەو کەسایەتییەی کە هەموو خەڵك باسیان دەکرد و دەیانناسی.

---

١ - الطبراني، المعجم الكبير ٤٣/٣

## د ـ گەشتەکانی

### ١ـ گەشتی شام و بەحیرای راهیب

هەموو کتێبەکانی سیرە ئاماژە بەوە دەکەن کە لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا و بە هاوڕێیەتی ئەبوو تالیبی مامی، یەکەمین گەشتی بەرەو شام کردووە. کاتێك قافڵەکە لە ڕێگەدا بۆ حەوانەوە خستیان، موحەممەدیان وەك پاسەوان و چاودێری قافڵەکە بەجێ هێشت. لەم کاتەدا ڕاهیبێك بەناوی "بەحیرا" ـ کە هەندێك بە هەڵە بە بوحەیرا ناوی دەبەن ـ شتێکی سەرنج ڕاکێش و سەیری بینی کە لەگەڵ قافڵەکەدا بەدەم ڕێوە بەردەوام بوو. ئەوەبوو هەورێکی بینی سێبەری بۆ کردبوون و لەگەڵیان دەبوو. کاتێك ئەوان دەڕۆیشتن، ئەویش لەگەڵیان دەڕۆیشت. کاتێکیش دەوەستان، ئەویش لەگەڵیان دەوەستا.

هەربۆیە ڕاهیبەکە خوانێکی سازکرد و، یەکێکی نارد بۆ ئەوەی بانگهێشتی هەموو ئەندامانی کاروانەکە بکات. ئەندامانی کاروانەکە زۆر سەرسام بوون بەم بانگهێشت کردنە. چونکە پێشتر ئەم ڕاهیبە گوێی بەو قافڵانە نەدەدا کە لەوێوە هاتوچۆیان دەکرد. هەموو ئەندامانی قافڵەکە چوون بە دەم بانگهێشتەکەوە، جگە لە حەزرەتی موحەممەد(ﷺ). بەڵام دیاربوو ڕاهیبەکە مەبەستەکەی نەپێکابوو و، لە نێو ئامادەبووواندا ئەو کەسەی نەدۆزیبووەوە کە بەدوایدا دەگەڕا. بۆیە پرسی کە ئایا هیچ کەسێك لە کاروانەکە ماوە نەهاتبێت بۆ دەعوەتەکەی؟ کاتێك وتیان کەسێکمان بەجێ هێشتووە بۆ چاودێریی کاروانەکە، داوای کرد ئەو کەسەش بانگهێشت بکەن. هەر کە بەجێماوی کاروانی بینی، یەکسەر بڕیاری خۆی دا و زانی ئەمە ئەو کەسەیە کە بەدوایدا وێڵە. ئینجا ڕووی کردە ئەبوو تالیب و پرسی کە ئەوە

کێیە؟ کە ئەبوو تالیب وتی ئەوە " کوڕمە" بەحیرا نەیویست بڕوای پێبکات. چونکە ئەبێت باوکی پێش ئەوەی ئەم لە دایك ببێت ، مردبێت. بەڵێ، زمانحاڵی سیمای ئەم کەسە ئەوەی دەگەیاند کە: " خۆیەتی" . لە پاشان بەحیرای ڕاهیب ئەبوو تالیبی بردە کەنارێکەوە و ئامۆژگاری ئەوەی کرد کە پێویستە ئەم گەشتە نەکات و، پێی وت: " جوولەکە گەلێکن ئێرەیی بەسەریاندا زاڵە، جا هەرکاتێك بەسیمایدا بزانن کە ئەوە دوایین پێغەمبەرە، بەڵایەکی بەسەردا دێنن، چونکە لە خۆیان نییە." ئەبوو تالیب گوێی بۆ ئامۆژگاریەکەی گرت و بیانوویەکی بۆ هاوڕێکانی هێنایەوە و لە قافڵەکە کشایەوە و، حەزرەتی موحەممەدی گەڕاندەوە بۆ مەککە.[1]

بەحیرا ڕاستیی دەوت. بەڵام شتێك هەبوو کە لێی بێ ئاگا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە حەزرەتی موحەممەد لە سایەی چاودێری و پارێزی خوای باڵادەستدایە و تا کۆتایی تەمەنی و، کامڵبوونی ئیسلام و نازڵ بوونی دوایین ئایەتی قورئان دەیپارێزێ. هەروەك ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ کردووە: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (المائدة: ٦٧) " (دڵنیاش بە کە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی." بەڵێ، پەروەردگاری ئەم بەڵێنەی پێدابوو، هەر بەو جۆرەش بەڵێنەکەی بۆ بەجێ هێنا.

## ٢ـ گەشتی دووهەمی بۆ شام

فەخری کائینات گەشتی دووهەمیشی هەر بۆ شام کرد. ئەو کات تەمەنی پیرۆزی بیست و پێنج ساڵ بوو. لەم گەشتەدا سەرقافڵەی ئەو کاروانە

١- ابن هشام، السيرة النبوية ١/٣١٩-٣٢٢.

بازرگانییه بوو که خەدیجه(ﷺ) ڕێکی خستبوو. هەروەها بەحیراشی بینییەوە. بەڵام ئەمجارە ڕاهیبەکە زۆر پیر بووبوو. کاتێك حەزرەتی موحەممەدی بینی زۆر دڵخۆش بوو، چونکە ئەو هەر لە چاوەڕوانیی ڕۆژێکی وادا بوو. ئەوجا بە پێغەمبەری خوای وت: "تۆ دەبیت بە پێغەمبەر، ئای خۆزگا بەو ڕۆژە دەگەیشتم کە پێغەمبەرایەتییەکەت ئاشکرا دەبێت، تا پێڵاوەکانت هەڵبگرم و خزمەتت بکەم." [1] ئەم ئاواتە نەهاتە دی و پیرە ڕاهیبیش بەو ڕۆژانە نەگەیشت. بەڵام ئەوە ڕاستییە کە ئەو قبووڵ کردنەی لە ڕۆژی دواییدا سوودی زۆری پێ دەگەیەنێت...

## ٣ـ هەمووان لە چاوەڕوانیی ئەودا بوون

ئەوانەی کە مژدەی هاتنی ئەویان دەدا و لە چاوەڕوانییدا بوون، یەك و دوان نەبوون، بەڵکو زۆر بوون. زەیدی کوری عەمری کوری نوفەیل یەکێك بوو لەوانە. زەید، باوکی سەعیدی کوڕی زەیدە، کە یەکێکە لە عەشەرەی موبەششەرە و مامی حەزرەتی عومەرە(ﷺ). ئەو یەکێك بوو لە حەنیفەکان (أحناف). واتە ئیمانی بە خوا هەبووە و لەسەردەمی نەفامیشدا پشتی لە بتەکان هەڵکردووە و وتویەتی کەڵك و زیانیان بەدەست نییە. بەڵێ، ئەمیش یەکێك بوو لەوانەی کە بە ماوەیەکی کورت بەر لە هەڵهاتنی خۆری نبووەت، ماڵئاوایی کرد و ئاوا بوو. مژدەی زۆری داوە، گرنگترینیان ئەوەیە کە وتوویەتی: "من دەزانم کە ئاینێکی نوێ سەر هەڵدەدات، بەڵام دڵنیا نیم فریای دەکەوم یان نا."

---

١ - إبن حجر، الأصابة ٣٥٣/١، ٥٠٦/٦.

شنەیەك وەك خەڵاتێکی خوایی بەر دڵی زەید کەوتبوو. دەروازەکانی دڵ و ویژدانی خستبوونە سەرپشت بۆ ئەوەی بە تەواوی پێشوازی لە حەق و ڕاستی بکات. ئیمانی بە خوایەکی تاك و تەنها هەبوو و خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردبوو. بەڵام ئەو خوایەی ئیمانی پێی بوو، بە باشی نەیدەناسی و نەیدەزانی چۆن بیپەرستێ.

یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە عامری کوری رەبیعەیە(رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە و، دەڵێ:

" جارێکیان لە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلەوە بیستم کە دەیوت: 'من چاوەڕوانی پێغەمبەرێك دەکەم لە نەوەی ئیسماعیل، دواییش لە نەوەی عەبدولموتەلیب. ئەگەر تا ئەو کاتە بمێنم، ئیمانی پێ دەهێنم و پشگیریی دەکەم و شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوایە. بەڵام ئەگەر تۆ بە دیداری گەیشتی، سەلامی منی پێ بگەیەنە. ناونیشانەکەیت پێ دەڵێم بۆ ئەوەی لات ڕوون بێت: نە زۆر درێژە و نە زۆر کورتە. قژی بە تەواوی خاو نییە و زۆریش لوول نییە. هەردەم ڕوومەتی سوور هەڵگەڕاوە. نیشانەی پێغەمبەرایەتی لە نێوان هەردوو شانیدایە و، ناوی ئەحمەدە. لەم شارەدا لەدایك دەبێ و دەبێت بە پێغەمبەر. ئینجا گەلەکەی دەری دەکەن، قینیان لەوەیە کە بۆی هێناون، بە ناچاری کۆچ دەکات بۆ یەثریب و لەوێ سەردەکەوێ. ئاگادار بە، لێی دوانەکەوی. من هەموو وڵات گەڕاوم بەدوای ئایینی ئیبراهیم دا. پرسیارم لە جوولەکە و فەلە و مەجوسی کردووە، هەموویان وتویانە خەریکە ئەو زاتە سەرهەڵدەدات. ئەو ناونیشانانەش کە دەیاندا، بەو جۆرە بوو کە پێم وتی. ئەڵێن هیچ پێغەمبەرێکیش لە دوایەوە نایەت'."

عامیری کوڕی رەبیعە دەڵێ: " کە موسڵمان بووم، ئەم وتانەی زەیدی

کـوڕی عــەمرم بـۆ پێغەمبــەری خـوا گێڕایــەوە و سـەلامەکەیم پێگەیانـد. پێغەمبــەریش(ﷺ) وەلاّمــی سـەلامەکەی دایــەوە و سـۆزی بـۆی خرۆشـا و فەرمووی: 'لـە بەھەشـتدا بینـیم لێـواری دامێنـی کراسـەکەی بـە زەویـدا دەخشا'." [1]

"وەرەقەی کوڕی نەوفەل"یش زانایەکی مەسیحی بوو و، ئامۆزای دایکـی ئیمانداران حەزرەتی خەدیجە بوو. کاتێك بۆ یەکەم جار وەحی دابەزییـە سـەر پێغەمبەری خوا، حەزرەتی خەدیجە بردی بۆ لای وەرەقەی کـوڕی نەوفـەل تـا بزانێت چی ڕوویداوە. رسول الله ئەوەی کـە دیبـووی بـۆی گێڕایـەوە. ئـەوجا وەرەقە پێی وت: " ئەمە ئەو یاسایەیە کە بۆ موسا نازڵ بووە. خۆزگە زیندوو بوومایە کاتێك گەلەکەت دەرت دەکەن." لەبەرامبەر ئەمەدا پێغەمبــەر(ﷺ) فەرمووی: " بۆ ئەوان دەرم دەکەن؟! " وەرەقە وتی: " بەڵێ، ھەر پێغەمبەرێك بەم پەیامەوە ھاتبێ، دژایەتی کراوە. ئەگەر بەو ڕۆژە بگەم، دەبمە پاڵپشتت و پشتیوانیی تەواوت لێ دەکەم." [2]

"عەبدوڵلای کوڕی سەلام"یش زانایەکی جوولەکە بوو. با گوێی لێ بگرین تا خۆی سەرگوزشتەی موسوڵمانبوونی خۆی بگێڕێتەوە: " کاتێك پێغەمبەری خوا گەیشتە مەدینە، منیش وەك خەڵکی چووم بۆ دیتنی. ئاپۆڕای خەڵکی دەورەیان لێ دابوو. ھەر کە دەموچاویم دی، یەکسەر زانیم کە ئەوە دەموچاوی درۆزن نییە.

یەکەم شتێك کە لێم بیست ئەوەبوو فـەرمووی: أَفْشُوا السَّـلاَمَ وَأَطْعِمُـوا الطَّعَامَ... " ئاسایش و ئاشـتی بلاّوبکەنـەوە و خـواردن بـدەن بەوانـەی کـە

---

١- إبن كثير، البداية و النهاية،: ٢٩٨/٢ ـ إبن حجر، الأصابة ٦١٥/٢.

٢- البخاري، بدء الوحي ٣

پێویستیانە..."ئیتر منیش دڵم هۆگری وتە ناوازەکانی و ڕوخسارە پڕ واتاکەی بوو. هەر بۆیە لەوێدا شایەتومانم هێنا و موسڵمان بووم. چونکە ئەو سیمایەی لەودا بەدیم کرد، تەنها سیمای پێغەمبەران بوو." [1]

عەبدوڵڵای کوری سەلام کەسایەتییەکی دیار بوو. "ئیبن حەجەر" لە کتێبی"الإصابة"دا دەفەرموێ: عەبدوڵڵا کەسێکی ناودار بووە و لە نەوەی یوسف پێغەمبەر(عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) بووە. [2]

قورئانی پیرۆز ستایشی شایەتییەکەی عەبدوڵڵای کوری سەلامی کردووە و، وەك بەڵگەیەکیش دژی کافرەکان دەیهێنێتەوە. ئەوەتا دەفەرموێ:

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

(الأحقاف: ١٠) " پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە، ئەی ئەوە چۆنە و حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت و، ئێوە ئاوا بڕوای پێنەکەن؟! هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە شایەتێک لە نەوەی ئیسرائیل شایەتی داوە کە چ تەورات و، چ قورئان لەیەک سەرچاوەوەن، ئەو باوەڕی هێنا بە محمد(صلی الله علیه وسلم) و قورئان کەچی ئێوە خۆتان بە گەورە زانی و، باوەڕتان نەهێنا... بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنموویی دەستەی ستەمکاران ناکات."

ئەو شاهیدەی نەوەی ئیسرائیل کە لێرەدا ئاماژەی پێدراوە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلامە. هەرچەند هەندێ لە تەفسیرنووسان پێیان وایە ئەو شاهیدە

---

١ - أحمد إبن حنبل، المسند ٤٥١/٥.

٢- إبن حجر، الاصابة ١١٨/٤.

حەزرەتی موسایە(ﷺ). بەو پێیەی ئەم سورەتە ـ سورەتی ئەحقاف ـ لە مەککە نازڵ بووە.[1] بەڵام بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە ئەگەرچی سورەتی ئەحقاف مەککیە، بەڵام ئەم ئایەتە مەدەنیە-واتە لە مەدینە نازڵ بووە- و ئاماژە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەکات.[2]

## ٤ـ بۆچی ئیمانیان نەهێنا؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو گاور و جوولەکەکان زۆر باش دەیانزانی کە ئەو پێغەمبەری خوایە، کەچی ڕق و کین و ئیرەیی دەبوونە ڕێگر لەبەردەمیان و نەیاندەهێشت باوەڕ بهێنن. ئەم زانینەشیان ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا بوو، بە جۆرێك کە تەنها سەرنج دانێکی پێغەمبەر(صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) بەس بوو بۆ ئەوەی ئیمانی پێ بهێنن، چونکە ئەوان ئاشنا بوون بە وەسف و ئاکارەکانی پێغەمبەری خوا. قورئانی پیرۆز تیشك دەخاتە سەر ئەم ڕاستییە و دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٤٦) " ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەناسن هەروەک چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەک لەوان ئەو ڕاستییە دەشارنەوە، لەکاتێکدا دەشزانن محمد(صلى الله عليه وسلم) فرستادەی خوایە."

لەم ئایەتەدا خوای گەورە ناوی پێغەمبەرەکەی ناهێنێت، بەڵکو بە "ئەو" ناوی دەبات. ئەمەش ئاماژەیە بەوەی کە هەموو ئەهلی کیتاب دوایەمین

١ - الطبري، جامع البيان ٩/٢٦.

٢ - الطبري، جامع البيان ١٢/٢٦.

پێغەمبەریان باش ناسیووە. واتە ئەوان دەزانن کە ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە لە تەورات و ئینجیل دا باسی هاتووە. ئەویش سەرداری مرۆڤایەتی حەزرەتی ئەحمەد یان موحەممەدە(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ)، چونکە ئەوان لە منداڵەکانی خۆیان باشتر دەیانناسی.

جارێکیان حەزرەتی عومەر(رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەپرسێ:

- ئایا حەزرەتی رسول اللە ت وەك کوڕی خۆت دەناسی؟

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:

- بەڵێ لەویش چاکتر دەمناسی.

جا کاتێك حەزرەتی عومەر لێی دەپرسێت "چۆن؟" ئەم وەڵامەی دەداتەوە: " لەوانەیە سەبارەت بە کوڕەکەم بکەومە گومانەوە. چونکە دەگونجێت هاوسەرەکەم فریوی دابم. بەڵام هێندەی تۆسقاڵێك گومانم نییە لەوەی کە حەزرەتی موحەممەد دوایەمین پێغەمبەری خوایە."

ئەم وەڵامە هێندە دڵی حەزرەتی عومەر خۆش دەکات، هەڵدەستێ سەری عەبدوڵڵا ماچ دەکات.[1]

## أ - غیرە و حەسوودیی

بەڵێ، ئەوان بە چاکی پێغەمبەری خوایان دەناسی. بەڵام ئیمان شتێکە و ناسین شتێکی تر. ئەوان دەیانناسی، بەڵام نەیان دەتوانی ئیمانی پێ بهێنن، چونکە غیرە و ئێرەیی ببوونە بەربەست لەبەردەم ئیمان هێنانیاندا:

---

١ - إبن كثير، تفسير القران العظيم ١/١٩٥ - سيوطي، الدر المنثور ١/٣٥٧.

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (البقرة: ٨٩)

" کاتێک له لایەن خواوه کتێبێک (قورئان) هات بۆیان کە: ئەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بەڕاستی دەزانێت، ئەوان پێشتر داوای سەرکەوتن و زاڵ بوونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون له خوا دەکرد بە هۆی شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، کەچی کاتێک ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی، بڕوایان پێ نەکرد. کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت."

خـوای گـەوره لـەم ئایەتـەدا هـۆی ڕاسـتەقینەی ئیمـان نـەهێنانیان بـە پێغەمبەر(ﷺ) باس دەکات. هەموو گرفتەکەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە خاتەمی پێغەمبەران جوولەکە نەبووە. ئەگەر پێغەمبەری خوا لە جوولەکەکان بوایە، بێ گومان هەڵسوکەوتیان زۆر جیاواز دەبوو.

بەڵگەش لەسەر ئەمە، عەبدوڵڵای کوڕی سەلامە. پاش موسڵمان بـوونی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و ئەم پێشنیازەی کرد: " ئەی پێغەمبەری خوا، لە جێگەیەکدا من بشارەوە و، هەرچی زانای جوولەکـە هەیـە لـە مەدینـەدا بانگیان بکـە. ئـەوجا پرسـیاری مـن و باوکمیـان لـێ بکـە. بەدڵنیاییـەوە وەڵامەکەیان ئەرێنی دەبێت. دواتـر مـن خـۆم ئاشـکرا دەکـەم و موسـڵمان بوونەکەم ڕادەگەیەنم." پێغەمبەری خواش ئەم پێشنیازەی پەسەند کرد. ئـیتر عەبدوڵڵای کوڕی سەلام لە جێیەکدا خۆی حەشار دا و، زانا جوولەکـەکانیش ئامادەبوون. پێغەمبەری خوا لێی پرسین: " عەبـدوڵڵای کـوری سـەلام چـۆن پیاوێکە لە ناوتاندا؟ " وەڵامیان دایەوە: " خۆشـی و باوکیشـی زانـاترین و

بەڕێزترینی ئێمەن." پاشان پێغەمبەر(صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) فەرمووی: " باشە ئەڵێن چی ئەگەر ئیمانم پێ بهێنیٚ؟ " وتیان: " مەحاڵە، هەرگیز شتی وا نابێت." ڕێك لەو کاتەدا عەبدوللای کوڕی سەلام(رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ) هاتە دەرەوە بۆ ناویان و، شایەتمانی هێنا و تەسدیقی پێغەمبەری خوای کرد. جوولەکەکان سەریان سوورمابوو. لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەوە، دەستبەجێ وتە ستایش ئامێزەکانی پێشوویان گەڕاندەوە و، کەوتنە بوختان هەڵبەستن: " ئەو خراپی کوڕی خراپانە." لەپاش ئەمە پێغەمبەری خوا ڕێی نەدا چی تر ئەو دووڕووانە لە حزووریدا دابنیشن.[١]

ئەم ڕووداوە بەڕوونی دەیسەلمێنێت کە جوولەکە پێغەمبەری خوایان دەناسی. بەڵام بڕیاری پێش وەخت و چەق بەستووییان بووبووە بەربەست لەوەی باوەڕبهێنن.

"سەلمانی فارسی"یش خۆی بۆ خۆی بەڵگەیەکی هەمیشەییە لەم بابەتەدا.

یەکەم جار ئاگرپەرست بوو. بەڵام بۆ دۆزینەوە و گەیشتن بە دینی حەق بەتاسەوە دەسووتا. دواتر چووە ناو ئاینی مەسیحییەوە. ئیتر لە کڵێسادا دەمایەوە و خۆی تەرخان کردبوو بۆ خواپەرستی. ئەو ڕاهیبەی شوێنی کەوتبوو زۆر بەساڵاچوو بوو و، وادەی مەرگی نزیك بووبووەوە. بۆیە سەلمان داوای لێ کرد وەسیەتی بۆ بکات تاوەکو بچێت بۆ لای ڕاهیبێکی دیکە. ئەویش ناونیشانی پێدا. بەم شێوەیە لای زۆرێك لە ڕاهیبەکان مایەوە. تا لەکۆتایدا کاتێك هەمان داوای لە ڕاهیبێکی بەختیار کرد کە لە دواساتەکانی ژیانیدا بوو، ئەم زانا مەسیحییە ئەم ئامۆژگاریەی کرد:

---

١ ـ البخاري، الأنبياء ١ ـ مناقب الأنصار ٤٥.

" کوڕی خۆم، کەسێك شك نابەم لەسەر ئەم ڕێبازەی ئێمە مابێت و بتنێرم بۆلای. بەڵام کاتی هاتنی پێغەمبەرێك نزیکە. ئەو بە ئاینی ئیبراهیم ڕەوانە دەکرێت. لەو جێیە سەر هەڵدەدات کە ئیبراهیم کۆچی بۆ کرد. ئینجا کۆچ دەکات بۆ جێگایەك کە کەوتووەتە نێوان دوو چیاوە کە بەردەکانی ڕەشن. لەوێ نیشتەجێ دەبێت. هەندێك نیشانەی هەیە ناشارێتەوە. دیاری وەردەگرێت، بەڵام خێر و صەدەقە وەرناگرێ. نێوان دوو دەفەی شانی نیشانە و مۆری پێغەمبەرایەتی پێوەیە. ئەگەر توانیت بگەیتە ئەو وڵاتە، ئەوا بڕۆ بۆلای."

با پاشماوەی بەسەرهاتەکە لە خۆیەوە ببیستین: " ماوەیەك لە عامووریە مامەوە بەدوای کاروانێکدا دەگەڕام تا بمگەیەنێتە ئەو جێگایەی کە ڕاهیبەکە ناونیشانی بۆ هەڵدابووم. لە کۆتایدا کاروانێکم دیتەوە و، ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی بەرامبەر بە کرێیەك منیش لەگەڵ خۆیاندا بەرن. بەڵام کاتێك گەیشتینە ئەو ناوچەیەی کە بە"وادي القری" ناسراوە، ستەمیان لێکردم و وەك ئەوەی کۆیلە بم، فرۆشتیانم بە کابرایەکی جوولەکە. جا کاتێك بێستانی خورمام دی، وتم پێدەچێ ئێرە ئەو جێگەیە بێ کە ڕاهیبەکە بۆی باسکردبووم. ئیتر لەوێ مامەوە هەتا یەکێك لە جوولەکەکانی "بەنو قورەیزە" منی لەو کابرایە کڕییەوە و بردمی بۆ مەدینە. لەوێ لە باخە خورماکاندا ئیشم دەکرد. بواریشم نەبوو هیچ هەواڵێك دەربارەی پێغەمبەری خوا بەدەست بهێنم. جارێکیان هەروەك ڕۆژانی ئاسایی، سەرکەوتبوومە سەر دارێك و خەریکی لێکردنەوەی خورما بووم.. کابرای جوولەکەش لە ژێر دارەکەدا دانیشتبوو. لەوکاتەدا یەکێك لە ئامۆزاکانی هات و، بە تووڕەییەوە وتی: 'خوا لەناویان بەرێ، خەڵکی هەموو بەرەو "قوبا" دەڕۆن. لە مەککەوە پیاوێك هاتووە و بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی دەکات، خەڵکەکەش وادەزانن پێغەمبەرە.'

هەر کە ئەو قسەیەم بیست، لەرزێکم لێ نیشت و خەریك بوو بکەومە خوارەوە بەسەر خاوەنەکەمدا. بە پەلە لە دارخورماکە دابەزیم و بە کابراکەم وت: ئەوە دەڵێی چی؟ ئەوە دەڵێی چی؟ ئەمە چ هەواڵێکە؟ کاتێك خاوەنەکەم ئەم پەرۆشیەمی بینی، بە پشتی دەستی زللەیەکی توندی لێدام و وتی: 'بە تۆ چی؟ برۆ بەلای کاری خۆتەوە.' منیش وتم: 'هیچ.. تەنها ویستم بزانم چی ڕوویداوە؟'دووبارە چوومەوە سەر درەختەکە. هەر کە ئێوارە هات، چیم هەبوو کۆمکردەوە و بە ئاراستەی قوبا ملی ڕێم گرتە بەر. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتبوو. چوومە پێشەوە و وتم:'ئێوە کەسانێکی هەژارن، منیش بەدوای شوێنێکدا دەگەڕام سەدەقەی بدەمێ. فەرموون بخۆن.' پێغەمبەری خواش ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەری و فەرمووی: 'ئێوە فەرموون.' بەڵام خۆی دەستی بۆ نەبرد. ئیتر منیش لە دڵی خۆمدا وتم: 'ئەمە یەکەم نیشانە کە ڕاهیبەکە باسی کرد.' ڕۆژی دواتر دیسانەوە چوومەوە. بەڵام ئەمجارەیان وتم: 'ئەمە سەدەقە نییە، بەڵکو دیارییە، فەرموون بخۆن.' ئەمجار پێغەمبەری خوا فەرمووی لە هاوەڵان کرد و خۆشی خواردی. وتم: 'نیشانەی دووەمیش هاتەدی.'

ئەمجا چووم بۆلای پێغەمبەری خوا لە "بقیع الغرقد" ـ کە گۆڕستانی مەدینەیە ـ شوێن جەنازەی یەکێك لە ئەصحابەکانی کەوتبوو. چوومە لایەوە و سەلامم لێکرد. دواتر چوومە پشتیەوە و هەوڵمدا مۆری پێغەمبەرایەتییەکەی نێو شانی ببینم. زانی کە نییەتم چییە.. جا خۆ سەرشانەکانیشی بەدەرەوە بوو.. ئیتر مۆری پێغەمبەرایەتیشم بینی. نیشانەی سێیەمیش هەروەك ئەوە بوو کە چەندین ساڵ پێشتر ڕاهیبەکە بۆی باس کردبووم. خۆم پێنەگیرا و باوەشم پیاکرد و دەستم کرد بە ماچکردنی مۆرەکە. ئنجا پێغەمبەری خوا فەرمووی: 'ئارامبەوە' منیش لە حزووریدا دانیشتم و

به درێژی بەسەرهاتەکەمم بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو و ویستی هاوەڵانیش گوێبیستی بەسەرهاتەکەم بن...“[1]

بەڵێ، ئەوانەی دەستبەرداری حەسوودی و کەللەڕەقیی بوون و تەماشای ئەویان کرد، ئەویان دۆزییەوە و مەفتوونی بوون. لەڕووی چۆنیەتیشەوە لە نێوان ئەمڕۆ و دوێنێدا تۆسقاڵێك جیاوازی نییە. وا ئەمڕۆش هەزاران کەس ڕاستیی پێغەمبەرایەتییەکەی بە چاوی خۆیان دەبینن و، تەسدیقی دەکەن و بە هەموو جیهانیشدا جاڕ دەدەن کە ئەو دواهەمین پێغەمبەری خوایە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە دیسان لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە سەبارەت بەوانەی کە واز لە عینادی و سەرکەشی ناهێنن و، پێداگریی دەکەن لەسەر نکووڵی کردنیان، وێڕای ئەوەی کە دەشزانن ئەو زاتە نێرراوی پەروەردگارە...

## ب ـ هەستی کێبەرکێ

موغیرەی کوڕی شوعبە(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە: ” من و ئەبوو جەهل پێکەوە دانیشتبووین. پێغەمبەری خوا هات بۆ لامان و، چەند شتێکی پێ ڕاگەیاندین. ئەبوو جەهل بە بێ ڕێزییەوە وتی: ’ئەی موحەممەد، ئەگەر بۆ ئەوە وا دەکەیت کە یەکێك بدۆزیتەوە لە دواڕۆژدا شایەتیت بۆ بدات لەسەر ئەوەی کە تەبلیغت کردووە و ئەرکی خۆتت ئەنجام داوە، ئەوا هیچ پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەیت، من شایەتیت بۆ دەدەم. بەڵام ئێستا وازبێنە و بێزارم مەکە.‘ لەپاش ئەوەی پێغەمبەری خوا جێی هێشتین، ڕووم کردە ئەبوو جەهل و لێم پرسی: ” ئەرێ بەڕاستی باوەڕی پێناکەیت؟ “ وەڵامی دامەوە:

---

١- ابن هشام، السيرة النبوية ٢/٤١-٤٧.

" له ڕاستیدا دەزانم كه ئەو پێغەمبەره. بەڵام هەر له كۆنەوه له نێوان ئێمه و هاشمییەكاندا كێبڕكێ هەیه. ئەوان شانازی بەوەوه دەكەن كه ڕیفاده و سیقایه له دەستی ئەواندایه. جا ئەگەر بشڵێن پێغەمبەر لـه ئێمەیـه، ئیـدی ئەمـه شتێكه بەرگەی ناگرم." [1]

پیاوانی قوڕەیش كۆبوونەوه و بڕیاریاندا "عوتبەی كوڕی ڕەبیعـه" بنێـرن تاكو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا گفتوگۆ بكات و قەناعەتی پێ بكات تا دەست له بانگەوازەكەی هەڵگرێ. عوتبه یەكێك بوو له بیرمەندانی ئەو سەردەمه و، شارەزاییەكی تەواوی له ئـەدەبیاتی عەرەبیـدا هـەبوو و خـاوەن سـەروەت و سامانێكی زۆر بوو. عوتبه چوو بـۆ لای سـەروەری هـەردوو جیهـان و، وای دانابوو ژیربازی پێچاوپێچی لۆژیكی بكات. بۆیه پرسی: " ئەی موحەممەد، تۆ باشتری یان عەبدوڵڵای باوكـت؟ " پێغەمبـەری خـوا وەڵامـی پرسـیارەكەیی نەدایەوه. نا، بەڵكو بەبێ دەنگبوون وەڵامی دایەوه، كه جوانترین وەڵامه بـۆ گێژ و گەوجەكان. عوتبه بەردەوام بوو: جا ئەگەر پێت وایه ئەو له تۆ باشتره، ئەوا بەدڵنیاییەوه ئەو، ئەو خوایانەی دەپەرست كه ئێستا تۆ سوكایەتییان پێ دەكەیت. نا، ئەگەر خۆتت لەوان پێ باشتره، ئەوا ئـەوكات قسـه بكـه و بـا منیش گوێت لێ بگرم.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسی: " ئایا قسەكانت تەواو بوون؟ " عوتبـه وتـی بەڵێ و بێدەنگ بوو. ئەوجا پێغەمبەری خوا لەسەر چۆك دانیشـت و دەسـتی كرد به خوێندنەوەی سورەتی "فصلت" له سەرەتاوه، تا ئایەتی سیانزه:

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾

---

١ - إبن إسحاق، السيرة ١٩١/٤ ـ إبن أبي شيبة، المصنف ٢٥٥/٧-٢٥٦.

" جا ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو باسی دەسەڵات و توانایی و زانایی خوای گەورەدا پشتیان هەڵکرد و گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی کە شریخە و بروسکە و کارەساتێکتان بەسەر بێت، وەک ئەوەی کە بەسەر عاد و سەموود هات ..."

کاتێك پێغەمبەری خوا گەیشتە ئەم ئایەتە، عوتبە خۆی پێ نەگیرا و وەك یەکێك تووشی گەشکە بووبێت ئاوها دەلەرزی. لەتاوا دەستی خستە سەر دەمی پێغەمبەر و بە پاڕانەوە پێی وت: " بۆ خاتری ئەو خوایەی باوەڕت پێیەتی، بێدەنگ بە."

لەم نێوەندەشدا گەورە پیاوانی مەککە چاوەڕوانی دەرەنجامی سەردانەکەی عوتبەیان دەکرد. ئەبوو جەهل گەڕانەوەی عوتبەی بەدڵ نەبوو. بۆیە ڕووی کردە ئەوانەی دەوروبەری و، وتی: " چۆن ڕۆشتبوو، ئاوەهاش گەڕایەوە." عوتبە دەستبەجێ ڕۆیشتەوەماڵەوە. ئەو ئایەتانەی کە بیستبوونی، وەك بروسکەی ئاسمان لەسەری دابوون. زۆری نەخایاند کە ئەو کەسەی دەرسی شەیتانەکانی دەدا ـ ئەبوو جەهل ـ خۆی گەیاندێ. چونکە دەترسا عوتبە باوەڕی هێنابێت. وای بە باش دەزانی دەستبەجێ گوێبیستی درێژەی ڕووداوەکە ببێت.. خاڵی لاوازی عوتبەی زۆر چاك دەزانی. دەماری فیز و لوتبەرزی عوتبەی دەگەست. کەوتە خۆی و، وتی:

" ئەی عوتبە، بیستومە موحەممەد زۆر ڕووی پێداویت. میوانداریی کردوویت و، خوانی بۆ ساز کردوویت. تۆش بەرامبەر بەو پێشوازیەی خۆت پێنەگیراوە و باوەڕت پێ هێناوە. بەڵێ، لەناو خەڵکدا ئەمە بڵاوە.." عوتبە

بەم قسانە تووڕە بوو و، وتی: " هەمووتان زۆر باش دەزانن من پێویستم بە نان و ئاوی ئەو نییە و، لە هەمووشتان دەوڵەمەندترم. بەڵام وتەکانی موحەممەد منیان هەژاندووە. چونکە ئەوەی خوێندیەوە شیعر نەبوو، لە قسەی قەشە و کاهین و جادووگەرەکانیش نەدەچوو. نازانم چی بڵێم؟! ئەو کەسێکی ڕاستگۆیە. کاتێك گوێم لێگرتبوو، ترسام لەوەی ئەوەی بەسەر هۆزی عاد و سەموددا هاتووە ، بەسەر ئێمەشدا بقەومێ..." [١]

## ج ـ چەند هۆکارێکی تر

لە ڕاستیدا ئەم دان پێدانانە تایبەت نەبوون بە یەك دووانێکەوە، بەڵکو ئەوە قەناعەتێکی گشتی بوو لایان. بەڵام هۆکارە نەرێنییەکانی هاوشێوەی ترس و تەماع و هەڵپە و کەللەڕەقی، ڕێی باوەڕهێنانی لێدەگرتن. بەڵێ، سەرەڕای ئەوەی دەشیانزانی، کەچی نەیاندەتوانی باوەڕی پێ بهێنن.

جا بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز بە مەبەستی باسکردنی ڕەوشی ئەوان و، دڵنەوایی کردنی پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) دەفەرموێ:

﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ (الأنعام: ٣٣)

" بەڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی خوانەناسان غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بەڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بەدرۆزن بزانن، بەڵکو ستەمکاران هەر داننانێن و ئینکاری ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن."

---

١ - إبن كثير، البداية والنهاية ٣/٦١-٦٤ ـ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/١٣٠-١٣٢

ئەوان چەندین تۆمەتت بـۆ هەڵدەبەسـتن، تـۆش بـەو تۆمەتـە ناڕەوایانـە دڵتەنگ دەبیت. بەڵام نەکەی بە قسە و گوفتاری ئـەو بەدبەختانـە دڵتـەنگ ببیت کە وا لە ژێر داخوازییەکانی جەستەیاندا پلیشاونەتەوە و بوونەتە دیل و زەبوونی نەفسیان و، ناتوانن دەسبەرداری نەریتەکانیان بن. لەڕاستیدا ئـەوان تۆ بەدرۆ ناخەنەوە، چونکە ناتوانن درۆ بدەنە پاڵ تۆ، چوونکە تـۆ زۆر دووری لە درۆ. ئەوەتا پێشتر خۆیان پێیان دەوتی "ئەمین". کەواتـە بڕوانـە ئاسـتی گەوجی و نەفامی ئەوانە، تانەنەت خۆشیان باوەڕیان بەوە نییـە کـە دەیدەنـە پاڵت. کەچی هەر بەردەوامیشن. کەوابێ چ پێویست بە دڵ تەنگیی دەکات!

بەڵێ، ئەگەر کەسێك هەبێت شایانی دڵ تەنگی و خەمباری بێـت، ئـەوا دەبێت ئەوانـە بـن کـە دەروازەکـانی دڵ و ویـژدانیان بـە ڕووی ئـەو زاتـەدا داخستووە کە جڵەوی دنیا و ئاخیرەتی بەدەستە. بەڵێ، دەبێ خـەم و پـەژارە بەشی ئەو کەسانە بێت کە بڕیاریان داوە لە تاریکسـتاندا بـژین، لەکاتێکـدا دنیایەکی چراخان وا لەپاڵیاندا...

## هـ ـ پێغەمبەری چاوەڕوانکراو و مژدەدراو

### ١ ـ دوعای ئیبراهیم(عليه السلام) و مژدەی عیسا(عليه السلام)

ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: " یا رسول الله، هەندێك باسی خۆت دەکەیت؟ " ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: " من دوعای حەزرەتی ئیبراهیم و مژدەی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمم." [١]

قورئانی پیرۆزیش ئەم بابەتەی لەدوو ئایەتی سەربەخۆ و جیاوازدا باس کردووە:

یەکەم: حەزرەتی ئیبراهیم(عليه السلام) :

﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولاً مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡ‌ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ (البقرة: ١٢٩)

" پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێک لە خۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و، کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاک بکاتەوە، بەڕاستی هەر تۆ خوای باڵادەست و دانایت."

دووەم: مژدەکەی حەزرەتی عیسا(عليه السلام): ﴿ وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسۡرَٲٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقً۬ا لِّمَا بَيۡنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَٲةِ وَمُبَشِّرَۢا

---

١ - أحمد إبن حنبل، المسند ٢٦٢/٥ ـ الطبراني، المعجم الكبير ١٧٥/٨ ـ حاكم، المستدرك ٦٥٦/٢.

بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ (الصف: ٦)

" بیریان بخەرەوە، کاتێک عیسای کوری مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە، ڕاستیی تەوراتیش دەسەلمێنم کە لە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێک کە دوای من دێت و نـــاوی "أحمد" ە، کەچی کاتێک بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواو و موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە."

بەڵێ، پێغەمبەری خـوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) هـەروا لەپڕێکـدا دەرنەکـەوت. بەڵکو پێغەمبەرێك بوو مژدەی هاتنی، پێش چەندەها سەدە درابوو و هەموو جیهان لە چاوەڕوانیی هاتنیدا بوون.

گەورەترین بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی بریتییە لەم قورئانە پیرۆزەی کە هەتاهەتایە موعجیزەیەکی نەمر و جاویدانە. سەدان ئایەتی قورئانی خاوەن "ئیعجازی بەیان" بەڵگەی سەلمێنەری پێغەمەبەرایەتی فەخری عالەمن. هەرکەس نەتوانێ نکوولّی هەموو قورئان بکات، هەرگیز ناشتوانێت نکوولّی لە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) بکات. ئەمە بابەتێکی سەربەخۆیە و لێرەدا باسی ناکەین. بەڵام لەو شوێنانەدا کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وەك بەڵگە دەهێنینەوە، کەم تا زۆر تیشك دەخەینە سەر ئەم بابەتەش.

## ٢- مژدەکانی تەورات

لێرەدا باسی هەندێك لەو مژدانە دەکەین کە تـاوەکو ئێسـتاش لـەبارەی پێغەمبەری خواوە لەناو تەورات و ئینجیل و زەبووردا ماون. ئەمـە سـەرباری

ئەوەی ئەم کتێبانە دووچاری سەدان دەستکاری کردن بوونەتەوە. ووردەکاری و درێژەی ئەم بابەتەش دەسپێرین بەو سەرچاوانەی کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارن بە بابەتەکەوە. بەتایبەت کتێبی "الرسالة الحميدية"ی زانای گەورە "حسين الجسر". ئێمە لێرەدا بە ئاماژەکردن بە چەند بەڵگەیەك ــ کە بەگرنگیان دەزانین — واز دێنین.

### أ ـ چیاكانی فاران

لە تەرجەمەی عەرەبی نوسخەیەکی تەوراتدا کە ساڵی ١٩٤٤ لە ئینگلتەرا چاپ کراوە هاتووە: ( جَاءَ اللهُ مِنْ سِينَاءَ، وَأَشْرَقَ مِنْ سَاعِيرَ، وَاسْتَعْلَنَ مِنْ جِبَالِ فَارَانَ.)[1]

واتە: " خوای گەورە لە سینادا ڕووی ڕەحمەتی کردە گرۆی ئادەمیی. لە ساعیریشدا تەجەللی کرد. لە چیاکانی فارانیشدا بەتەواوی دەرکەوت."

ڕەحمەت و چاکەی پەروەردگار بۆ سەر مرۆڤایەتی لە"سینا"دا دەرکەوت. ئەمەش ئەو شوێنەیە کە خوای گەورە لەگەڵ حەزرەتی موسادا دوا. ئەم ڕەحمەتەش ئەو پێغەمبەرایەتییە بوو کە بە حەزرەتی موسا درا. بەڵام لە"ساعیر"دا ـ کە فەڵەستینە ـ ڕەحمەتی خوای میهرەبان لە ڕێگەی وەحییەوە هات و، حەزرەتی عیسا و ئەوانەی دەوروبەریشی داپۆشی. لە هەمان کاتدا حەزرەتی مەسیح لە پێغەمبەرە پایە بەرزەکانە و، جێگەی درەوشانەوە و بەخششە زۆرەکانی خوای گەورەیە. بەڵام لەبەرئەوەی زۆرێك لە خەڵکی هەردوو چەمکی درەوشانەوە (تَجَلي) و دەرکەوتن (ظُهور)یان تێکەڵ

١- التثنية، الباب ٣٣ ڕستەی: ٢.

(إلتباس) کردووه، ئەوا دووچاری سەرلێشێوان بوون.

بەڵێ، تەجەللی لە حەزرەتی عیسادا بریتیە لە نەفخەی ئیلاهی. بەڵام لە شاخەکانی "فاران"دا خوای باڵادەست بە نهێنی ئەحەدییەت و مەقامی فەردییەت دەرکەوت.

"فاران"یش واتە مەککە. ئەوەتا لە شوێنێکی تری تەوراتدا هاتووە کە حەزرەتی ئیبراهیم، ئیسماعیلی کوڕی لە فاران بەجێ هێشت. کەواتە مەبەست لە فاران مەککەیە. شایانی باسە ئەم سێ مژدەیە پەیوەندیان هەیە بە پێغەمبەران: حەزرەتی موسا، حەزرەتی عیسا و حەزرەتی فەخری کائینات موحەممەد(عَلَيۡهِمُ السَّلَامُ) کە دوایەمینی پێغەمبەرانە.

درێژەی ئایەتەکە بەم جۆرەیە: ( وَمَعَـهُ أُلُـوفُ الأَطْهَـارِ، فِـي يَمِينِـهِ سِنَّةِ النَّـارِ.) واتە: " هەزاران یاوەری پاك و گەوهەر ئاسای لەگەڵدایە. لەدەستی ڕاستیشیدا تەورێکی دووسەرەی ئاگرینی پێیە." ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو زاتە فەرمانی جیهادی پێدراوە.

ئاشکرایە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێش دابەزینی وەحی لە ئەشکەوتی حیرادا دەچووە خەڵوەتەوە و سەرگەرمی پەرستش و بیرکردنەوە دەبوو. یەکەمجاریش لەم ئەشکەوتەدا وەحی بۆ نازڵ بوو.[1] ئەگەر فاران مەککە نەبێ، ئەی دەبێ کوێ بێ؟ لە چ شوێنێکی تری دنیادا نوورێکی وەك دینی ئیسلام پرشنگی داوە و بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاوبووەتەوە؟

بەو پێیەی لە دنیادا شوێنێکی تر نیە ئەم وەسفانەی بەسەردا بچەسپێت، ئەوا ئەو وشەی "فاران"ە جگە لە مەککە، هیچ شوێنێکی تر نییە. هەروەکو

---

١ - البخاري، بدء الوحي ٣.

پێشتریش وتمان، ئایەتی ژمارە ۲۱ی "تكوين" كە باس لە جێگەی نیشتەجێ بوونی حەزرەتی ئیسماعیل دەكات: (وَسَكَنَ بَرِيَّةَ فَارَانَ) واتە: " لە چۆڵەوانی فاران نیشتەجێ بوو." گەورەترین و ڕوونترین بەڵگەی سەلمێنەری قسەكەمانە. كەسیش ناتوانێت پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێت. ئەو ڕەخنانەش كە لەم بارەیەوە دەگیرێن، تەنها ڕەخنەی ڕووكەش و نازانستین. ئینجا كۆتایی ئایەتەكە، كە ئاماژە بەهاوەڵە بەڕێزەكانی دەكات و بەوەش كە ڕاسپێرراون بەجیهاد كردن لە پێناوی خوادا، هیچ كەلێنێك بۆ گومان و دوودڵی ناهێڵێتەوە كە مەبەستی حەزرەتی موحەممەدە(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

### ب ـ لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل

ئایەتی دووەم لە تەورات دەڵێ: ( وَسَوْفَ أُقِيمُ لَهُمْ نَبِيّاً مِثْلَكَ مِنْ بَيْنِ إِخْوَتِهِمْ، وَأَجْعَلُ كَلاَمِي فِي فَمِهِ، وَيُكَلِّمُهُمْ بِكُلِّ شَيْءٍ آمُرُ بِهِ.) [١] خوای گەورە لەم ئایەتەی تەوراتدا، بەم شێوەیە لەگەڵ حەزرەتی موسادا دەدوێت: " لەمەولا لەنێو براكانیاندا (نەوەكانی ئیسرائیل) پێغەمبەرێكی وەك تۆیان بۆ دەنێرم. قسەی خۆم دەخەمە سەر زمانی ئەو، فەرمانی هەرشتێكی پێ بدەم، بەوانی دەڵێت."

ئایەتی ۱۹ ش تەواوكاری ئەمەیە: ( وَمَنْ لَمْ يُطِعْ كَلاَمَهُ الَّذِي يَتَكَلَّمُ بِهِ بِاسْمِي فَأَنَا أَكُونُ الْمُنْتَقِمَ مِنْ ذَلِكَ.) واتە: " هەر كەسێكیش گوێڕایەڵی ئەو قسانەی نەكات كە بەناوی منەوە دەیانكات، ئەوا هەر خۆم تۆڵەی لێ

١- التثنية، باب ١٨ ڕستەی: ١٨.

دەسەنەوە."

دەستەواژەی "براکانی بەنی ئیسرائیل" کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، ئاماژە بۆ پێغەمبەرێك دەکات کە لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلە. تاکە پێغەمبەرێکی زانراویش کە لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیلەوە هاتبێت، حەزرەتی موحەممەدە(ﷺ). هەروەها وەك حەزرەتی موسا(عليه السلام) بە شەریعەتێکەوە دێت. لەلایەکی ترەوە، ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات ئەو پێغەمبەرە مژدە دراوەی دێت، نەخوێندەوارە.

بابەتی تۆڵەکردنەوە لە یاخیبووانیش کە لە ئایەتەکەدا باس کراوە، ئاماژە بۆ سنور و سزاکان (العقوبات) دەکات، کە ئەمەش تەنها لە ئاینی ئیسلامدا بوونی هەیە. ناگونجێ حەزرەتی عیسا یان حەزرەتی یوشەع(عليهما السلام) ئەو پێغەمبەرە بێت کە لە تەوراتدا مژدەی لەبارەوە دراوە. چونکە ئەم دوو پێغەمبەرە لە نەوەی ئیسرائیلن. سەرەڕای ئەوەش حەزرەتی عیسا لە زۆرێك لە بابەتەکاندا یاسا و شەریعەتێکی تازەی نەهێناوە. بەڵکو پەیڕەوی یاسا و شەریعەتی حەزرەتی موسا بووە.

ئەوەش کە حەزرەتی یوشەع لە حەزرەتی موسا ناچێت، هەروەك ڕۆژی ڕووناك ئاشکرایە. چونکە حەزرەتی یوشەع خاوەنی شەریعەتێکی نوێ نەبووە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولاً شَٰهِدًا عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولاً ﴾ (المزمل: ١٥) " خۆ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانەکردوون کە بووەتە شایەت بەسەرتانەوە، هەروەکو چۆن بۆ لای فیرعەونیش پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کرد." ئاماژە بۆ لێکچوونی حەزرەتی موسا و پێغەمبەری پێشەوامان دەکات. لە ڕاستیدا دوای بەڵگەی ئەم ئایەتە، پێویست بە هیچ بەڵگەیەکی تر ناکات.

### ج ـ تایبەتمەندییەکانی تری

عەبدوڵلای کوڕی عـەمری کـوڕی عـاص و عەبـدوڵلای کـوڕی سـەلام و کەعبی ئەحبار(ﷺ) ناویانگیان بەوە دەرکردبوو کە شارەزاترین و زانـاترینی ئەو سەردەمە بوون لە کتێبە کۆنەکاندا. لەوانەوە ڕیوایەت کراوە کە تـەورات پێش ئەوەی ئەم دەسکارییەی ئێستای بکرێ، ئەم ئایەتەی تێـدا بـووە: ( يَـا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّـراً وَنَـذِيراً وَحِـرْزاً لِلأُمِّيِّـيِّنَ أَنْـتَ عَبْـدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ الْمُتَوَكِّلَ لَيْسَ بِفَـظٍّ وَلاَ غَلِـيظٍ وَلاَ سَـخَّابٍ فِـي الأَسْـوَاقِ وَلاَ يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ وَلَنْ يَقْبِضَـهُ اللهُ حَتَّـى يُقِـيمَ بِـهِ الْمِلَّـةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ.)[1] واتە: " ئەی پێغەمبەر! وا تۆمان نارد و کردمانیت بە شایەت و مزگێنیدەر و ترسێنەر و داڵدەی نەخوێنـدەواران. تـۆ بەندە و نێرراوی منی، ناوم ناوی (الْمُتَوَكِّلْ) (پشت بەخوا ئەستور). زۆر بڵێ و دڵڕەق نییە و لەناو بازاڕدا هات و هـاوار ناکـات. پاداشـی خراپـە بەخراپـە ناداتەوە، بەڵکو لێبوردە و لێخۆشـبووە. خـوا نایباتـەوە بـۆ لای خـۆی، تـا ئەوکاتەی ڕێبازی لار و لەویری پێ ڕاست دەکاتەوە و خەڵکی دەڵێن: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ)."

ئێستا با بیربکەینەوە: ئایەتەکەی تەورات مەبەستی کێیە؟ پێویسـت بـە تۆژینەوەیەکی قووڵ ناکات تاوەکو تێبگـەین کـە مانـای ڕواڵـەتی ئایەتەکـە پەیوەندی بە پێغەمبەرێکەوە هەیـە کـە هێشـتا نـەهاتووە. لـە ئایەتەکـەوە لەوەش دەگـەین کـە جگـە لـە پێشـەوای مرۆڤایـەتی حـەزرەتی موحەممـەد موسـتەفا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هـیچ کەسـێکی تـر نییـە بـۆ هـەموو خـەڵك و سەرانسەری جیهان نێررابێ. هەروەك ئایەتەکە پێی بفەرموێت:

---

١ - البخاري، البيوع: ٥٠ ـ تفسير (سورة الفتح) ٣ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢/١٧٤

ئەی پێغەمبەر، ئێمە تۆمان بە ڕێبازی ڕاست و دروست و مژدە بەخشەوە بۆ هەموو جیهانیان ڕەوانە کردووە. بە ترسێنەریش بۆ ئەوانەی ڕێچکەی خواروخێچیان گرتووە و لە پاشەڕۆژی خراپ ئاگاداریان دەکەیتەوە. لەبەردەم هەموو خراپەکاری و ڕەوشتە نزمەکاندا دەوەستی تاکو خەڵکان نەکەونە ناو ئاگری بڵێسەدار. هەروەها ببیتە مەشخەڵ و ڕووناکی بۆ سەرلێشێواوانی ناو تاریکایی. دەستی ئەوانەش بگریت بەرەو بەهەشت و ڕەزامەندی خوا بیانبەیت. ئێمە ناردومانی تاوەکو لە سەرویەندی نەفامیدا ببیتە پاڵپشت و قەڵا بۆ نەخوێندەواران. هەرکاتێك ئەوان شوێنت کەوتن و تۆیان کردە پاڵپشت و پەناگەی خۆیان، ئەوسا پارێزراو دەبن و، میهر و بەزەیی پەروەردگار دەیانگرێتەوە. تۆ بەندە و ڕەوانەکراوی منی. (بەڵێ، ئەوەتا ئێمەش هەمیشە لە نوێژەکانماندا کاتێ تەحیات دەخوێنین شایەتی دەدەین کە ئەو بەندە و پێغەمبەری خودایە.) بەڕاستی سیفەتی "المتوكل"م بۆ داناوی. ئەگەر هەر هەموو جیهانیش دژایەتیت بکەن و بەرامبەرت بوەستن و لەگەڵت بەشەڕ بێن، ناتوانن تاڵە موویەکت بڕاکێنن. بەڵێ هەموو پێغەمبەرێك لە پشت بەستن بەخوادا ئاسۆیەکی تایبەتی هەیە. بەڵام تۆ لەم بوارەدا تایبەتمەندییەکی ترت هەیە، هەر لەبەر ئەمەیە کە ناوم ناویت " الْمُتَوَكِّلَ ".

ئینجا وتارەکە ڕوو دەکاتە جێناوی نادیار (ضَمیر الغائِب) ـ کە ئەمەش جۆرێکە لە ستایش ـ و دەڵێ: ئەو هەرگیز کەسێکی تووڕە و دڵ ڕەنجێن و نەفرین خواز نییە. بەڵکو دارای ئەدەب و ڕەوشتێکی سەنگین و بەسام و ویقارە. ئەو کەسێك نییە لە بازاڕەکاندا هاوار بکات و وتەی نەشیاو بەزاریدا بێت. چونکە بەکارهێنانی ئەو شێوازە بۆ ڕاکێشانی سەرنج و بایەخی خەڵکی، بەڵگەی لاوازی و نیشانەی لەخۆیایی بوونە، کە بە دڵنیاییەوە "ئەو" لەم ئاکارە نەخوازراوانە پاك و بەرییە.

ئەو هەرگیز وەڵامی خراپە بە خراپە ناداتەوە. ئەوەتا عەرەبێکی دەشتەکی دێت بۆ لای و کراسەکەی لە ملی جەڕ دەدا و، پێی دەڵێ حەقی خۆمم بدەرێ! ئەم ڕەفتارە زبرە کە دەماری تووڕەیی لە دەروونی هاوەڵاندا دەوروژێنێ، زەردەخەنە دەخاتە سەر لێوی پێغەمبەری خوا ـ کە نموونەی بەرجەستەبووی سۆز و میهرەبانییە ـ و بە هاوەڵەکانی دەفەرموێ: " مافی خۆی بدەنێ." [1]

بەڵێ، ئاکاری بەرزی ئەو بە جۆرێك بوو کە تەنانەت لەو تاوانانەش خۆش دەبوو کە هەرگیز شایانی لێ خۆشبوون نەبوون، بەمەرجێك بەزاندنی سنوورەکانی شەرعی تێدا نەبووبێ. ئەوەتا سەرنج بدەن چۆن پاش فەتحی مەککە لێبووردنی نواند لەگەڵ خەڵکی مەککەدا کە چەندین ساڵ ئازار و ئەشکەنجەیان دابوو. سەرباری ئەوەی هەر چییەکی بویستایە دەیکرد بەرامبەریان، کەچی پێی وتن: إذهَبُوا فأَنتُم الطُلقاءُ. [2] " بڕۆن، ئێوە ئازادن."

تەقدیری ئیلاهی وەهای بڕیار دابوو تا ئەو کاتەی مرۆڤانێك کە لەنێو گومڕایدان و نغرۆی ژینی جەهالەتن، بەو نوورەی کە پێغەمبەر هێناویەتی، ئیستیقامەت وەردەگرن، خوای باڵادەست خۆشەویستەکەی بۆ لای خۆی نەباتەوە. نەشیبردەوە...

واتە، بڵندبوونەوەی بەرەو " الرَّفِيقَ الْأَعْلَى" لەپاش کامڵ بوونی دین و کۆتایی هاتنی وەزیفەکەی دەبوو. ئەو کاتەش کە هاوەڵەکانی -دەرچوانی مەدرەسەی نبووەت- مەقامی نمایندەیی ئەویان بەدەست دەهێنا، لە خەڵکی دادەبڕا و دەچووە حزووری دۆستی حەقیقی. ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەو

---

١- البخاري، فرض الخمس ١٩ ـ ابوداود، الادب ٦٨ ـ مسلم، الزكاة ٤٤.
٢- إبن هشام، السيرة النبوية ٧٤/٥ ـ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ١٦١/٢ ـ البيهقي، السنن الكبرى ١١٨/٩.

فەرمانبەرییەی کە ڕووی لە ژیانی دنیایە، ئەو دەم دەگەیشتە پایان.

بەڵێ، تەورات بەم خەسڵەتانە وەسفی دەکرد. ئەوکاتیش کە تەشریفی هێنا، سیرەی پیرۆزی بووە نمونەیەکی بەرجەستەی ئەو وەسف و ناونیشانانە. لەڕاستیدا ئەوەی لە تەوراتدا هاتبوو، تەرزی ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو. کەواتە دەبێ ئەو پێغەمبەرە کێ بێ کە تەورات باسی دەکات؟ ئایا لە مێژوودا کەسێکی تر هەبووە ژیانی بەو شێوەیە بووبێت کە لە سەرەوە باس کراوە؟ بەبێ هیچ گومانێك نەخێر، کەواتە ئەو کەسایەتیەی باس کراوە جگە لە پێغەمبەری سەروەرمان هیچ کەسێکی تر نییە.

## ٣ـ مژدەکانی ئینجیل

### أ ـ فارقلیط

لە ئینجیلی یوحەننادا هاتووە: ( قال المسيح: إنني ذاهب الى ربي و ربكم لكي يرسل لكم فارقليط، الذي سيأتي اليكم بالتأويل.) واتە: " مەسیح وتی: من دەڕۆم بۆ لای پەروەردگاری منیش و ئێوەش، بۆ ئەوەی "فارقلیط"تان بۆ بنێرێت، کە ئەو تەئویل و ڕوونکردنەوەتان بۆ دێنێت." [١]

وشەی "فارقلیط" بە مانای گیانی حەق دێت کە حەق و ناحەق لە یەکتر جیا دەکاتەوە. بەڵێ، بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خۆشەویستمانە کە گیانی حەقە. چونکە دڵە مردووەکان بەو حەقە نەبێت کە ئەو هێناویەتی، زیندوو نابنەوە. ئەو پێغەمبەرە نازدارە هەموو شتێکی بەخت کرد و هەوڵ و کۆششێکی زۆری دا تا هیدایەت و حەقی گەیاندە خەڵك. ئەگەر ئەو

---

١ـ باب ١٤.١

تێکۆشانه بێ وچانەی ئەو نەبوایه، حەق لە ناحەق جیا نـەدەبووەوه. کەواتـە فارقلیط ئەو کەسەیه کـە مەسـیح(عليه السلام) مـژدەی پـێ داوه. ئـەویش دوایـین پێغەمبـەر و نێـردراوه کـە فـەخری کائینـات، حـەزرەتی موحەمـەدی ئەمینه(صلى الله عليه وسلم).

لە ئینجیلی یوحەننا، بابی ١٤، ئایەتی ١٥ و ١٦ دا هاتووه:

( إن كُنتُم تُحِبُّونني أَطَعتُم أوامري، أمّا أنا، فَسَأَبتَهِلُ الى الرَّب لِيُرسِلَ لَكُم مُعيناً آخر، وروحُ الحقيقة (فارقليط) لكي يَبقى مَعَكُم على الدَّوام.) واته: " ئەگەر ئێوه منتان خۆش بوێ، ئەوا بەگوێم دەکەن. منیش لەلای خۆمەوه لە پەروەردگار دەپاڕێمەوه تاکو هاوکار و یاریدەدەرێکی ترتان بۆ بنێرێ کە ڕۆحی حەقیقەت و "فارقلیط"ە. بۆئەوەی هەمیشه لەگەڵتاندا بمێنێتەوه."

ئێستا با بەڕێز سەرنج لەم ئایەتانه بدەین:

( فارقليط هو روح القُدس الذي سَيُرسِلُهُ الرَّب بِإسمي أي نَبيّاً مِثلي. سيُعَلِّمُكُم كلَّ شَيءٍ و سَيُذكِرُكُم بما قُلتُهُ لَكُم.)[1] واته: " فارقلیط بریتییه لەو ڕۆحه پیرۆزەی کە خودا بە ناوی منەوه دەینێرێ و وەك منیش پێغەمبەره. ئەوسا ئەو هەموو شتێکتان فێر دەکات و، ئەوەشتان بەبیر دەهێنێتەوه کە من پێشتر پێم وتبوون."

( عندما يَأتي فارقليط سَيَشهَدُ لي و سَتَشهَدونَ أَنتُم لي.)[2] واته: " کاتێك فارقلیط دێت، شایەتیم بۆ دەدات، ئێوەش شایەتیی بۆ من دەدەن."

( ولكن أقول لكم الحق: من الآفضَل لَكُم أَن أذهَب، لأنّي إن كُنتُ لا أذهب

---

١ـ یوحنا، باب: ١٤، ڕستەی: ٢٦

٢ـ یوحنا، باب: ١٥، ڕستەی: ٢٦-٢٧

لايَأتي فارقليط إِلَيكُم، ولكنّي إن ذَهبتُ، أَرسَلَهُ إِلَـيكُم.)[1] واته: " بەڵام مـن ڕاستی و حەقیقەتتان پێ دەڵێم: بۆ ئێوە وا چاکترە من بڕۆم. چونکە تـا مـن نەڕۆم فارقلیط نایەت بۆ لاتان. بـەڵام کـە مـن ڕۆیشـتم ئەوسـا خـوا بۆتـان دەنێرێ."

(و عندما يأتي فارقليط يبكت العـالم علـى الخطيئـة.)[2] واتـە: " کاتێـك فارقلیط دێت، هەموو دنیا لەسەر گوناح و تاوان سەرزەنشت دەکات."

لە سەرەتادا ئینجیل بەزمانی عیبرانی بووە. دوایی تەرجەمە کـراوە بـۆ زمانی یۆنانی. جا ئەو تەرجەمە عەرەبییانەی لە بەردەستماندان، ئەوانەن کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕراون. وشەی "فارقلیط" لە تەرجەمە یۆنانییەکەی یەکەمجاردا هاتووە، بەڵام ئێمە ئەو وشە ڕەسەنە نازانین کە لە زمانی عیبریـدا لە بەرامبەریەوە هاتووە.

وشەی فارقلیط لە یۆنانییەوە تەرجەمە کراوە بۆ زمانی عـەرەبی. واتـە چووەتە ناو زمانی عەرەبیـەوە، لـە شـێوەی بەعـەرەبی کـردن. بـەڵام ئێمـە بابەتەکەمان لەسەر ئەم وشەیە بنیات نانێین. بەڵکو هەوڵ دەدەیـن هاتنـەدی هەموو تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو ـ کە لە ئینجیلدا مژدەی هاتنی دراوە ـ لە سەروەرماندا ببینین.

با وشەکانی شەیدایەکی پێغەمبەر بکەینـە سـەردێڕ.. بـەڵێ، مـەولانا جەلالەددینی ڕۆمی چەند جوان گوتویەتی:

---

١ـ یوحنا، باب: ١٦، ڕستەی: ٧

٢ ـ یوحنا، باب: ١٦، ڕستەی: ٨

بود در إنجيل نعت مصطفى أن سر پيغمبر آن بحر صفا

بود ذكر حليها و شكل أو بود ذكر غز و صوم اكل أو

واته:

" وەسفی موستەفا لە ئینجیلدا بوونی هەبوو

هەر خۆی نهێنی پێغەمبەران و بەحری سەفا بوو

ئاكار و ڕەفتار و غەزا و ڕۆژوو و خواردنی

بوونی هەبوو لە ئینجیلدا یەك بە یەكی."

## ب ـ سەرۆكی جیهان

لە ئینجیلی یوحەننا، بابی ١٤، ئایەتی ٣٠ دا هاتووە:

( لن أُكَلِّمُكُم كَثيراً بعد، فان سيد هذا العالم قادم عليَّ، ولا شئ له فيَّ.)
واتە: " حەزرەتی مەسیح وتی: لەمەولا زۆر قسەتان لەگەڵ ناكەم، چونكە سەرداری جیهان لە سەروبەدی هاتنیدایە. هیچ شتێكی ئەو لەمندا نییە..."

لە بابی ٧٢، ئایەتی ٨ و دواتری زەبوردا هاتووە كە:

( ستمتد مملكته من البحر الى البحر، من النهر الى أقاصي الارض.. أمامه يركع أهل البادية -ملوك ترشيش و الجزر يحملون اليه الهدايا، ملوك الشَّبا و سبا يقدمون العطايا..ينحني أمامه جميع الملوك، و تتعبد له كل الامم، لأنه ينقذ المسكين المستغيث البائس الذى لا معونة له... يعطف على الفقير و المحتاج، و يخلص نفوس المساكين أذ يفتدى نفوسهم من الظلم و العنف، و يحفظ حياتهم، لانها ثمينة فى عينيه ليحيي الملك، ليعط له ذهب شبا، و

ليصلوا من أجله دائما، و يطلبوا له بركة الله كل نهار. و تتكاثر الغلال في الارض، و على رؤوس الجبال، و تتماوج مثل أرز لبنان، ويزهر أهل المدينة كعشبا الارض- يخلد أسمه الى الدهر و يدوم اسمه كديمومة الشمس، ويتبارك الناس به، وتَطوّ به كل الامم.)

واته: " ڕووبەری مەملەکەتەکەی لە دەریاوە درێژ دەبێتەوە بۆ دەریا، لە ڕوبارەوە بۆ ئەوپەڕی زەوی. خەڵکی بیابان لەبەردەمیدا چۆك دەدەن. پاشایانی تەرشیش و دورگەکان دیاری و خەلاّتی بۆ دێنن، پاشایانی شەبا و سەبا شاباشی پێشکەش دەکەن، هەموو پاشایان لە ئاستیدا چۆك دادەدەن، سەرجەم نەتەوەکان دەبنە گوێڕایەڵی. چونکە هەژار و بێدار و داماو و بێکەسەکان ڕزگار دەکات. سۆز و میهری خۆی دەڕێژێ بەسەر هەژاراندا. دڵ و دەروونی بێ نەوا و داماوان لە ستەم و چەوسانەوە ڕزگار دەکات و ژیانیان دەپارێزێت. چونکە گیانی ئەوانی بەلاوە بەنرخە. زێڕی شەبا پێشکەش دەکات، بۆئەوەی هەمیشە دوعای بۆ بکەن و، سەلاّواتی لێ بدەن و ڕۆژانە داوای بەرەکەتی خوای بۆ بکەن. هەروەها دانەوێڵە زۆر دەبێت لە دەشتەکاندا و بەسەر چیاکانەوە دەڕوێت و وەك چەڵتوکی لوبنان قەف و گوڵ دەکات.. خەڵکی شارەکان وەك گژوگیای زەوی زۆر و جەنجاڵ دەبن. ناوی ئەو تا هەتایە نەمر دەبێت و وەك خۆر بەردەوام دەمێنێت. خەڵك بەهۆی ئەوەوە تووشی فەڕو بەرەکەت دەبن."

هەروەکو لە پێشتر وتمان، هەڵوێستەکردنمان لەسەر ئەم بڕگانە، بە مەبەستی دەست خستنی بیرۆکەیەکی گشتی بوو لەمەڕ بابەتەکە. گەرنا نیازی قوڵبوونەوەمان نییە. بەلاّم لێرەدا خۆمان ناگرین نەڵێین: لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵە بەردەوام و کۆششە سەرومڕەی کە لەمڕۆ و دوێنێدا لە لایەن هەندێك لەو مەسیحی و جوولەکانەوە کە حەسادەت و ئێرەیی لە ناخیاندا

بنجی داکوتاوه، دەدڕێن بۆ شێواندن و تەحریفکردنی کتێبەکانیان، کەچی ئەو تەورات و ئینجیلانەی کە ئێستا لەبەردەستدان، چەندین مزگێنی و ئاماژەیان سەبارەت بە پێغەمبەرمان تێدایە. پشت بەخوا لە داهاتوودا، لە سایەی کۆششی مێژوونوسە وردبین و دڵسۆزەکانمانەوە، گەر ئەو نوسخانەی تەورات و ئینجیل و زەبوورمان دەست بکەون کە کەمتر دەستیان تێ وەردراوە، ئەوکاتە هەمووان بگرە گشتینەی خەڵکیش ئەو ئاماژە ئاشکرا و دیارانە دەبینن کە لەبارەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدەوە(ﷺ) هاتوون و، پێویست بە هیچ ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەیەك ناکەن. لەوانەیە ئەو فەرمایشتانەی هەواڵی پاڵفتەبوونی مەسیحییەت دەدەن لە ئاخر زەماندا، دیسان ئاماژەیەکی تر بێت بۆ ئەم بۆچوونە.[١]

ئەمە سەرباری ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا چەسپاوە کە تەورات و ئینجیل ئاماژە بە پێغەمبەر و یارانی دەکەن. جا بۆیە نکوولی کردن لەم باسە بە لادان و کوفر دادەنرێت.[٢]

---

١ ـ بۆ نموونە بڕوانە: البخاري، الأنبياء ٤٩ ـ مسلم، الأيمان ٢٤٤-٢٤٧.

٢ـ ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ﴾ (الأعراف: ١٥٧) " ئەوانەی کە شوێنی ئەم (محمد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاورو جوو، ناو و نیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا."

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا﴾.

## و ـ ئەو مرۆڤی ڕەهەندە جیاوازەکان بوو

مرۆڤی سەرگەردانی ئەم سەردەمە هەروەك چۆن زۆرێك لە پێـوەری بـەها باڵاکانی بزرکردووە، ئاوهاش ڕوانین و ڕەفتاریی بەرامبەر بە پێغەمبەران و بە تایبـەتی تـریش سـەرداری پێغەمبـەران(ﷺ) سـەرلێشێواو بووەتـەوە. دیـارە هەڵەیـەکی گەورەیـە ئەگـەر ئـەو زاتـە بـە پێـوەر و تـەرازووەکانی مـرۆڤ هەڵبسەنگێنرێ، تەنانەت مەحاڵیشە. چونکە بە ڕۆح و توانایەکی ناوازە و بێ وێنەی ئەوتۆوە نێرراوە، کە ئەم دنیایـە سـەرلەنوێ ڕێـك بخاتـەوە و چـەندین ئاسۆی پرشنگدار لەبەردەم مرۆڤایەتیدا واڵا بکات. لەبەرئەوە نرخانـدنی لـە توانست و هەڵسەنگاندنی ئێمە بەدەرە. بۆیە هەرچۆنێك شاعیران وەسفی بکەن هێشتا مافی خۆی نادەنێ. ئا لەم سۆنگەیەوە بـووە کـە "حەسسـانی کـوڕی ثابت" ـ کە لە هەموو کەس باشتری ناسیوە ـ وتویەتی:

وَمَا مَدَحْتُ مُحَمَّداً بِمَقَالَتِي  وَلَكِنْ مَدَحْتُ مَقَالَتِي بِمُحَمَّدِ.

---

(الفتح: ٢٩) " محمد(ﷺ) ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنووش و سوژدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و پایە بەرزییە لەلای خوا، نیشانەی چاکی و پاکییان لەناوچەوانیاندا دیاریە و دەدرەوشێتەوە لەئەنجامی سوژدە بردن و خوا پەرستییاندا، جا ئەو بەڕێزانە ئەوە نموونە و پێناسەیانە لە تەوراتدا، نموونە و پێناسەشیان لە ئینجیلیشدا وەک ڕووەکێک وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕاوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێ بگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن وا پێگەیی؟! چۆن ئاوا خۆی گرت؟! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا کافران داخ لەدڵ بکات، جا خوای بەدەسەلات بەڵێنی بەوانە داوە کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لەوان: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە و بێ سنووریان پێببەخشێت."

هەروەها بڕوانە: البخاري، البيوع ٥٠ - تفسـير (سـورة الفتح) ٣ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ١٧٤/٢. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: سيوطى، الخصائص الكبرى ٢٦/١-٤٤.

" من مەدح و ستایشی حەزرەتی موحەممەدم بە وتەکانم نەکردووە..

بەڵکو وتەکانم بە ستایشی حەزرەتی موحەممەد مەدح و سەنا کردووە "

باس و خواسی پیرۆزو بۆنخۆشی ئەوە، کە جوانی و ڕازەوەیی دەبەخشێ بە گوفتار و وشەکان. ئەگینا هیچ کام لە دەربڕینەکانی ئێمە ناتوانن هیچی پێ ببەخشن. "ئەبوو تەمام"[1] یش هەمان واتا و ناوەڕۆك بەڵام بە کەمێ دەسکارییەوە دووبارە دەکاتەوە. بیرمەندی گەورەی سەردەمیش، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسیش لە وەسفی قورئانی پیرۆزدا هەمان واتا دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ:

وَمَا مَدَحْتُ الْقُرْآنَ بِكَلِمَاتِي وَلَكِنْ مَدَحْتُ كَلِمَاتِ بِالْقُرْآنِ [2]

هەموو ئەمانە، دەرەنجامی هاوبەشی کردنی هەمان هەست و هەزرە و، سەرچاوەی ئیلهامی هەمووشیان هەر یەکە. بە چەند گوزارشت و بڕگەیەکی جیاواز ئاماژەیان بۆ هەمان ڕاستی کردووە. ئەوەی هەندێکیان بەکورتی لێی داون، ئەوانی تر درێژەیان پێ داوە، کەچی یەکێکی تر بەچەند کۆپلە شیعرێك دەری بڕیوە. بەڵام هەموویان بە دەوری هەمان مەبەست و تەوەرەدا دەخولێنەوە.

بۆ ئێمەش هەمان شتە. ئەوەتا دەمانەوێ گوزارشت لەو نیعمەتە هەرە

---

١ ـ ضياءالدين الموصلي، المثل السائر ٢/٣٥٧ ـ القلقشندى، صبح الأعشى ٢/٣٢١

٢ ـ " من مەدح و ستایشی قورئانم بە وتەکانم نەکردووە.. بەڵکو وتەکانم بە ستایشی قورئان مەدح و سەنا کردووە." بەدیعوززەمان، مەکتووبات، مەکتووبی ٢٨، مەسەلەی حەوتەم، هۆکاری چوارەم. وەرگێڕانی فارووق ڕەسووڵ یەحیا.

مەزنە بکەین کە خەڵاتمان کراوە. لە ناخی دڵمانەوە شوکر و ستایشی خوا بکەین کە ئێمەی کردووە بە ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد موستەفا(ﷺ). ئەمە فەزڵێکی ئیلاهییە. خوای گەورە فەزڵی خۆی دەبەخشێت بەو کەسەی دەیەوێت و، بەو ئەندازەیەش کە تەقدیری فەرمووە. بەڵێ، قەدر و بەهای ئەم نیعمەتە لەودیوی هەموو کێشانە و مەزەندە کردنێکەوەیە. ئەو نیعمەتەی لەچاو ئومەتەکانی تردا بەئێمە بەخشراوە، دەریایەکی بێ کەنارە لە فەزڵ و چاکە.

بەڵام ئەم بابەتە ڕوویەکی تری هەیە کە ناتوانم فەرامۆشی بکەم و نەپرسم: ئایا ئێمە دڵێکی وامان هەیە شایستەی ئەو زاتە بێت کە سوڵتانی دڵانە؟ ئایا ئەو سوڵتانە ئاسوودەیە بەو سەڵتەنەتەی لە دڵەکاندا هەیەتی؟ ئایا دەروازەکانی ناخمان هەمیشە بۆی لەسەر پشتن؟ ئایا لە هەڵسان و دانیشتن و خواردن و خواردنەوە و گشت چالاکیەکانماندا هەست بە حزووری ئەو دەکەین؟ ئایا ڕەوڕەوی ژیانمان لەسەر ئەو ڕاستەشەقامەیە کە ئەو بۆی کێشاوین؟ جا ئەگەر وەڵامان ئەرێنیی بێ، ئەوا زۆر بەختەوەرین. چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئیدی سیمای درەخشان و نووری جەماڵی، خەون و خولیاکانمان دەڕازێنێتەوە و بووینەتە کۆمەڵێکی موحەممەدی. جا ئەو کۆمەڵەش کە کاڵای ڕەوشتی ئەو دەپۆشێ و، ژیانی بە ئەدەب و ڕەویەی موحەممەدی دەڕازێنێتەوە، دەبێتە پایەی هاوسەنگیی لە جیهاندا. پێم وایە تاکە هۆکاری نەگەیشتنیشمان بەم هاوسەنگیە، ئەوەیە کە هێشتا نەگەیشتووین بە ئاستی پێویست لە ئاوێتە بوونمان بە ڕۆحی موحەممەدی.

ئەو مرۆڤێکی هەڵبژاردە بوو و، بە چاودێریی تایبەتی خوایی بەدیهێنرابوو. خۆ تەنیا تەشریف هێنانی وەك مرۆڤێك بۆ نێومان بە گەورەترین بەختەوەری دادەنرێ. چونکە خودی بەهەشت و فیردەوسیش

شەرەفمەند دەبن بە تەشریفی. گەورەترین ئەرکێکش بکەوێتە ئەستۆی ئێمە، ناساندن و باسکردنیەتی بە شێوەیەك کە شایستەی قەد و قامەتی ئەو زاتە مەزنە بێت. دیارە مرۆڤایەتی هەرگیز ناگاتە پلەی ڕاستەقینەی خۆی، تا بەتەواوی لەو زاتە تێنەگات و هەنگاوەکانی هەڵنەگرێت. لە ڕاستیدا منیش نیەتی ئەوەم هێناوە. بەڵام هەروەك لە سەرەتاوە وتم، من سوار چاکی ئەو مەیدانە و وتاربێژی ئەو وتارە نیم. لەگەڵ ئەوەشدا تاکە ئاوات و خولیای ژیانم بریتیە لە ناساندنی ئەو زاتە.. تاقە هونەر و سەرمایەشم، دڵسۆزیمە..

بۆ ماوەیەکی زۆر دڵی خۆم بەوە دەدایەوە کە "قطمیر"ێکی بەر دەرگاکەیم. بەڵام بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار خەریك بوو ئەو هیوایەشم لەدەست بدەم. پاشان بەخۆمم وت: خۆزگە لەبری ئەوەی وەك مرۆڤ بەدیهێنراوم، تاڵە موویەك بوومایە لە شوێنێکی جەستەی موبارەکی ئەو سەروەرەدا. بەڵێ، کاشکێ تا ئەو ئەندازەیە نزیك دەبوومەوە لەو زاتەی کە بووەتە مەزهەری لوتف و میهری پەروەردگار. ڕۆژگارێکی تریش بە سەرمدا گوزەرا و هەر بەو ئاواتەوە دەژیام. بەڵام تا زیاتر ناسیم، باشتر دڵنیا بووم لەوەی کە من شایان و لەبارنیم بۆ هاتنەدی ئەو ئاوات و خۆزگانە. ئیتر ئێستا هەموو هیوا و ئاواتم بریتییە لەوەی ببمە تاکێك لە ئوممەتەکەی. چونکە ئومێدم وایە خوای میهرەبان هیچ یەکێك لە ئوممەتەکەی بێ بەش ناکات لە شەفاعەتی پێغەمبەرەکەی، بۆیە منیش دەخاتە ناویانەوە و، دەفەرموێ: هُمُ الْقَوْمُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ.[1]

سەرەڕای هەموو ئەمانە، لە قووڵایی دڵمەوە نییەتی باسکردن و ناساندنی ئەو زاتەم هێنا. سەرجەمی کۆشش و تەقەلاشم، هاویشتنی پزیسکێکە کە

---

١- مسلم، الذكر ٢٥ ـ الترمذي، الدعوات ١٢٩ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢/٣٨٢،٣٥٨،٢٥١.

گڕی ئەوینی موحەممەدی لە دڵی نەوەی ئێستادا بڵێسە پێ بسێنێت. بەڵام چی بکەم؟! لەم کارەدا وەك مێروولەیەکم نیازی حەجی هێنابێ. خۆ دەزانێ کە قاچە کورتەکانی ناتوانن ئەو هەموو ڕێگا دوورە ببڕن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵخۆشە، چونکە ئەگەر بشمرێت لەو ڕێگەیەدا دەمرێ کە بەرەو حەج دەڕوات. خۆ هەموو ئاواتی منیش ئەوەیە لەم ڕێگەیەدا بمرم...

بەڵێ، پێغەمبەری خوا خاوەن ماهیەتێکی تایبەتییە و پەیوەندی و مامەڵەی لەتەك ڕەهەندە جیاوازەکاندا هەیە. ئەوەش کە دەکەوێتە ئەستۆی ئێمەوە، ئەوەیە کە خۆمان بە گوێرەی لەرەلەری شەپۆلی دنیاکەی ئەو ڕێك بخەین. هەرکاتێکیش ئەمە دەستەبەر بوو، ئیتر لەو نێوەندەدا ئاخاوتنی ئاشکرا و، گفتوگۆی هێمائامێز دەست پێ دەکات. جا ئەوکات رسول الله خۆی فەرمان دەدات و بەڕێوەبردن دەگرێتە دەست. ئەو کۆمەڵەی ئەو سەرکردایەتی دەکات و ئەو کۆمەڵگەیەش کە ئەو بەڕێوەی دەبات، کۆمەڵگەیەکی ڕەگ داکوتاو و بەرزی ئەوتۆیە، تەنانەت فریشتەکانیش خۆزگەی پێ دەخوازن. هەموو ستایش و گوزارشتێکیش لە ئاست وەسفکردنیدا کۆڵەوارە.

لەوانەیە ئەوەی دەیڵێین بەلای هەندێکەوە بابەتی نەبێ، چ خەم! لە کاتێکدا هەموو ڕۆژێك چەندین لاوی نوورانی، چەندەها مزگێنی مەعنەوییان لە پێغەمبەرەوە پێدەگات؟ چ خەم! لە دوای ئەوەی هەندێك کەس ڕاستەوخۆ و بێ پەردە و لە عالەمی شەهادەتدا پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەبەستن؟

ئەو هەمیشە بە ڕۆحیانەت و، بەلای هەندێکیشەوە، بە جەستەی نوورانییەوە لەناوماندایە. ئیمامی "سیوطی" دەگێڕێتەوە کە زیاتر لە حەفتا جار بە ئاشکرا بە خزمەت پێغەمبەری خوا گەیشتووە و قسەی لەگەڵدا

کــــردووه.[1] بـــەڵێ، پێغەمـــبـــەری خوا ـ بەو شـــێوەیەی کە ئێمە دەیـزانین ـ نەمردووە. بەڵکو تەنها ڕەهەندی گۆڕیوە. دەکەوینە هەڵەوە ئەگەر وەفاتی ئەو، وەکو وەفاتی هەر کەسێکی تری ئاسایی وەربگرین. ئەوەتا قورئان بۆمان باس دەکات کە نابێت بە شەهیدان ـ کە دوو پلە لە خوار مەقامی پێغەمبەرانەوەن ـ بوترێ مردوون.[2] دەی کەوابێ چۆن دەکرێ بڵێین پێغەمبەریخوا (ﷺ) مردووە ـ بەو جۆرەی کە ئێمە لە مردن حاڵی بووین ـ ؟ بەڵێ، هەر ئەوەندە ئەتوانین بڵێین کە: ئەو گوازراوەتەوە بۆ مەودایەك و ڕەهەندێکی تر.

هەربۆیە ئەو کەسانەی ڕوانینەکانیان دەگاتە ئەو ڕەهەندانە، بە دڵنیاییەوە لەوێدا ئەو دەبینن و بەردەوام بۆی دەڕوانن.

ئەوانەی توانیویانە لە زیندانی جەستە ڕزگار بـبن و گەیشـتوون بـە پلـەی ژیانی دڵ و ڕۆح، دەتوانن لە یەك کاتدا لە ڕابردوو و داهاتووشدا بژین. ئەوەتا دەبینی مرۆڤی ئەو ڕەهەندە لە هەمان ساتدا، هەم لە تەنیشت تۆدا دانیشتووە و هـەم لـە چـاخی بەختەوەریشـدا (عصـر السـعادة) لـە حـزووری فـەخری کائیناتدایە. تەنانەت لە نێو زاتە وەلییەکاندا کەسانێك هـەن بـە "ئەبـدال" ناسراون و، خوای گەورە توانایەکی وەهای پێ بەخشیون کە لە یەك کاتدا لـە

---

١ - النبهاني، الفتح الكبير ٧/١ ـ جامع الكرامات الأولياء، ١٥٨/٢.

٢- ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴾ (البقرة: ١٥٤) " جا هەرگیز بەو کەسانەی لە ڕێگەی خوادا دەکوژرێن و شەهید دەبن، مەڵێن: مردوون، نەخێر ئەوانە زیندوون و بەڵام ئێوە هەست بە زیندوویەتی ئەوان ناکەن." ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۢ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ (ال-عمران: ١٦٩) " هەرگیز وا مەزانن و وا دامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا کوژران (شەهید بوون)، مردوون، نەخێر وا نییە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی بەهرەوەرن ."

چەندین شوێن بوونیان دەبێت. دەسا ئەی بۆ سـولتانی پێغەمبـەران هـەم لـە ئاخیرەت و هەم لە دنیا، هەم لە نێوان ئێمەدا و هەم لە پێش چاوی فریشتەكان و پێغەمبەراندا(عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) لە هەمان كات و سـاتدا بـوونی نـەبێت؟ بـەڵێ، بوونی هەیە و بوونیشی دەبێت.

دەمەوێت هەموو ئەو شتانەی باس كران، بكـەم بـە بناغەیـەك بـۆ ئـەو بابەتانـــەی لەمـــەودوا باســـیان دەكـــەین. چـــونكە كاتێـــك دەڕوانینـــە پێغەمبەران(عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) بە گشتی و پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) بەتایبەتی، گۆشەنیگای ڕوانین و نییەت زۆر گرنگە. داخۆ ئەگەر تێگەیشتن و حاڵی بوون لە ئەولیا و ئەصفیـا و ئـەبرار و مـوقەرڕەبین ـ چ جـای ئـەنبیـائی عیزام ـ داخوازی پاڵفتەیی ڕۆح و پاكژیی دڵ بێت، دەبێـت دەركـی پێغەمبـەران لـە كەشی تەماوی و دووكەڵاویی جیسمانیەتدا چۆن مەیسەر ببێت؟..

جا بۆ ئەوەی لێیان حاڵی ببین، دەبێ بە حزووری دڵ و هەموو لایەنە ناسك (لەطیفە)كانمانەوە ڕوویان تێ بكەین. جا ئەگەر ئەو كەسە خودی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت، ئەوا پێویستە ئەو وردەكاری و تەركیزە چەندەها قاتی تریش زیاد بكرێت. با ئەوەش لەولاوە بوەستێ كە ئاستی تێگەیشتنی هەر یەك لە ئێمە، شوێنكەوتەی هێزی بینینی چاوی دڵیەتی. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هیچ كەس ناتوانێ بەتەواوی مانا دەركی بكات و لێی تێبگات. بەڵێ:

وَكَيْفَ يُدْرِكُ حَقِيقَتَهُ قَوْمٌ      نِيَامٌ تَسَلَّوْا عَنْهُ بِالْحُلُمِ

" دەی چۆن كەسانێكی نووستوو دەركی حەقیقەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەكەن، كە بیانەوێ بەخەو بینین دڵی خۆیانی پێ خۆش بكەن؟! " (بوصەیری)

# أ ـ ئامانج له ناردنی پێغەمبەران

هەرچەندە پێغەمەران(عَلَيۡهِمُ‌ٱلسَّلَامُ) لـە پلـە و پایەیانـدا جیـاوازن،[1] بـەڵام هەموویان لەوەدا هاوبەشن کە کەسانێکی هەڵبژێرراون و مەزهەری تەجـەللی زاتی پەروەردگارن. خوای گەورە کردوونییەتە بەنـدە نزیـك و تایبەتییـەکانی خۆی و لە ژێر چاودێریی خۆیدا پەروەردەی کردوون. ڕێی نەداوە جگە لە زاتی خۆی، هیچ شتێکی تر لە دڵیاندا تەخت دابنێت.

وەك سـەرجەمی پێغەمبـەران - بگـرە لـەوانیش زیـاتر - حـەزرەتی موحەممەد(صَلَّى‌ٱللَّهُ‌عَلَيۡهِ‌وَسَلَّمَ) جگە لە خوای گەورە، چاوی هیچی تـری نـەدیوە و هەمیشە ڕووی لەو بووە. بەڵێ، جگە لەو خوایە(ﷻ) هیچ شتێك نەیتوانیوە دیدەی پێغەمبـەر بـۆ لای خـۆی لار بکاتـەوە و ڕووی پـێ وەرگێـڕێ. هـەر لەوساتەوە کە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە، خـوای خـۆی دیـوە. کـاتێکیش بـۆ دواجار چاوەکانی لێکنا، دەیفەرموو: " اَللهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى". بـا ئـەوە لـە دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشەوە(رَضِيَ‌ٱللَّهُ‌عَنۡهَا) ببیستین:

" هـەرکاتێك پێغەمبـەری خـوا نـەخۆش بکەوتایـە، دەهـات بـۆ لام و دەیفەرموو:'دوعام بۆ بکە'. منیش بـەو نیـازەی بەرەکـەتی دەسـتی ببێتـە مایەی شیفا، دەستی موبارەکیم دەگرت و دەستم دەخستە سەر سەری ـ ئـەو سەرەی کە لە سەروو کات و شوێنەوەیە ـ و دەکەوتمە دوعا کردن.[2] کەچی لە دواین نەخۆش کەوتنیدا، کاتێك ویستم دەسـتی بگـرم، بـە تونـدی دەسـتی

---

١ - بڕوانە سورەتی: البقرة: ٢٥٣، الأسراء: ٥٥

٢- البخاري، فضائل القران ١٤ ـ المغازي، ٨٣ ـ مسلم، السلام ٥١

کێشایە دواوە و فەرمووی: ' اَللهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى '.»[1]

دیاربوو ئیتر پێغەمبەری خوا دەیویست دۆستە دنیاییەکانی بەجێ بهێڵێت و، لە ڕەهەندێکی تردا بگات بە حزووری پەروەردگاری، کە دۆستی ڕاستەقینەیە. کەواتە هۆکاری هاتنی ئەو هەموو پێغەمبەرە ـ بەتایبەتی پێغەمبەری پێشەوامان ـ بۆ دنیا چی بووە، کە هەر لە ساتی یەکەمی هاتنیانەوە بۆ دنیا، هەتا ماڵئاوایی و جیا بوونەوەیان، هەر لەو چەشنە ژیانەدا ژیاون؟ بۆ بەدەست هێنانی چ مەبەستێك هاتوون؟

توێژینەوە لەم بابەتە گرنگە، لە دوو ڕووەوە گرنگی و بایەخی زیاتر بەدەست دەهێنێت:

یەکەم: خستنە ڕووی کۆمەڵە بەڵگەیەکی گومان بڕ بۆ ئەوانەی کە مەقامی بڵندی پێغەمبەرایەتی (نبووەت) نابینن و هەروەك کەسانی ئاسایی تەماشای پێغەمبەران دەکەن.

دووهەم: تیشك خستنە سەر ئەو ڕێباز و شێوازەی کە میراتگرانی دەعوای نبووەت پێویستە لەمڕۆدا ڕەچاوی بکەن.

لێکۆڵینەوە لەم بابەتە ـ لە هەر ڕوویەك لە ڕووەکانییەوە بێت ـ پانتایی و فراوانی بابەتەکە ناگۆڕێت. بۆیە ئێمەش بەبێ گوێ دانە هیچ ڕیزبەندییەك ، هەوڵ دەدەین بیرو بۆچوونەکانمان لە شێوەی چەند بڕگەیەکدا بخەینە پێش چاو.

## ١ـ بەندایەتی

ئامانجی ناردنی پێغەمبەران لەگەڵ ئامانجی بەدیهێنانی مرۆڤ، لە هەمان

---

١- مسلم، السلام ٤٦ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ١٢٠/٦

خاڵدا یەك دەگرنەوە، ئەویش هێڵی بەندایەتییە. قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم لایەنە دەکات و، دەفەرموێ:﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات: ٥٦) " بێگومان من جین و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن."

کەواتە مەبەستی سەرەکی و ئامانجی هەرە مەزن لە بەدیهێنرانمان، بریتییە لە ناسینی خوای گەورە و ئەنجامدانی ئەرکی بەندایەتی بەو جۆرەی کە شایانیەتی. ئەگەر نا پێکەوەنانی سامان و کۆشك و تەلار، یان نەوسنی و رابواردن و بوونە خاوەن ماڵ و منداڵێك کە تەنها ڕووی لە دنیا بێت، نابنە ئامانج. بەڵێ ڕاستە ئەمانە پێداویستی سروشتیی ئادەمیزادن، بەڵام هەرگیز نابنە تەوەرە و ئامانجی بەدیهێنانمان. جا ئیتر پێغەمبەران بۆ پیشاندانی ئەم ڕێگە ڕاز ئامێزە هاتوون.

قورئانی پیرۆز تیشك دەخاتە سەر ئەم ڕاستییە و دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ﴾ (الأنبياء: ٢٥) " ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن."

لە ئایەتێکی تریشیدا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ

﴿فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ (النحل:٣٦)

" سوێند بە خوا، بێگومان ئێمە لە ناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر. جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیر و هۆش و ژیری خۆی خستەکار و بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا. هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویدا و سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو. "

ئەم ئایەتە بەئاشکرا ئاماژە بە حیکمەتی نێررانی پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ) دەکات، کە دوور کەوتنەوەیە لە پەرستنی بت و پەیکەرەکان و، ڕابەرایەتی کردنی مرۆڤە بۆ پەرستنی خوای بالآدەست.

## جیاوازیی سەروەرمان

ڕەوشی پێغەمبەرمان(عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) جیاوازترە. لەپاڵ ئەوەدا کە بەڕەحمەت نێرراوە بۆ سەرانسەری جیهانیان، لەهەمان کاتدا ڕاسپێرراوە کە بانگەوازی جن و ئادەمی بکات بۆ ڕێگەی عیبادەت. ئەوەتا هاوەڵی بەڕێز "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود" دەگێڕێتەوە:

" لەگەڵ پێغەمبەری خوادا چووین بۆ شوێنێك. بەچوار دەورمدا خەتێکی کێشا و پێی فەرمووم لێی نەیەمە دەرەوە، ئەوجا خۆشی دوورکەوتەوە. پاش کەمێك گوێم لە دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوێك بوو. ئەمە نیگەرانی کردم، چونکە دەترسام پێغەمبەری خوا شتێکی بەسەردا هاتبێت. لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی لە جێگەی خۆم بجووڵێم چونکە پێی فەرموو بووم کە نەجووڵێم. لە پاشان رسول الله(ﷺ) گەڕایەوە و منیش هۆکاری ئەو دەنگانەم لێ پرسی. پێغەمبەری خواش فەرمووی: 'بەرەی جیننی ئیمانیان هێنا و بەیعەتیان

پێدام. بەم هۆیەوە مشت و مڕ لە نێوانیاندا سەری هەڵدا. ئینجا ئیمانـدار و بێ ئیمانەکانیان کەوتنە گیانی یەکتری. هۆکاری ئەو دەنگانەش ئەمـە بـوو. هەروەها هەواڵی مردنیشم پێ ڕاگەیەندرا".[1]

وەك بڵێی ناوەڕۆکی کۆتا وشەکانی پێغەمبەری خوا ئـەم پەیامـەی لـەخۆ گرتبوو:

ئەرکی من، کردنەوەی ئەو شـاڕێگەیەیە کـە ئیـنس و جـن دەگەیەنێتـە هیدایەت. جا بەو پێیەی ئەمڕۆ گرۆی جیننیش باوەڕیان هێنا و گوێڕایـەڵیان کردم، ئەوا ئەرکم لە دنیادا تەواو بووە و مانەوەم هیچ مانایەکی نییـە. ئـیتر لەمەودوا ماڵئاوایش بکەم دەبێ...

بـەڵێ، بیرکردنـەوەی پێغەمبـەری خـوا بـەم جـۆرە بـوو. لـە دووتـوێی وتەکانیشیدا، ئاماژەی بە نهێنی و حیکمەتی ریسالەت دەکرد. ئێ خۆ هـەر خۆی لە بابەتی هەڵبژاردن لە نێوان دنیـا و قیامەتـدا فێـری ئـەم دوعایـەی کردووین:

اَللهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي.[2]
" خوایە گیان بمژیێنە تا ئەو کاتەی ژیان خێرە بۆم، بشـمرێنە ئەگـەر مـردن چاکترە بۆم."

## ٢ـ تەبلیغ

مەبەستێکی تر لە ناردنی پێغەمبەران بریتیە لەڕاگەیاندن (تەبلیغ)ی دین. خۆ ئەگەر ئـەوان نەنێررانایـە، ئـەوا هـیچ شـتێکمان لـەبارەی عیبادەتـەوە

١ - الطبري، جامع البيان ٣٣/٢٤ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٤٤٩/١
٢ - البخاري، المرضاة ١٩ ـ مسلم، الذكر ١٠

نەدەزانی. هیچ ئەمر و نەهییەکمان پێ نەدەگەیشت و ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆمان نەدەزانی. واتە بێ ئاگا دەبووین لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج. هەروەها هەرگیز هەڵوێستی خۆمان لە مەڕ قەدەغەکراوەکانی وەك ئارەق و قومار و زینا و جەردەیی و سوو خواردن نەدەزانی. بەڵێ، ئێمە ئەمانە و چەندین مەسەلەی هاوشێوەی ئەمانە، تەنها لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە فێربووین. بەم فەرمانبەرییە مەزنەش دەوترێت: "وەزیفەی ریسالەت" چونکە سەرجەم پێغەمبەران(عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ) بە هەمان پەیامەوە هاتوون. تەنانەت ئەگەر جیاوازی لە هەندێ لق و وردەکاریی پەیامەکانیشیاندا بووبێت، بەڵام لە بابەتە سەرەکیەکانیاندا هەمان شتیان ڕاگەیاندووە.[1]

ئەم مەبەست و ئەرکە گشتییە لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە باس دەکرێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخۡشَوۡنَهُۥ وَلَا يَخۡشَوۡنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا﴾ (الأحزاب: ٣٩) " ئەوانەی کە پەیامەکانی خوا دەگەیەنن، وە لەو دەترسن و جگە لەو، لە هیچ کەسی تر ناترسن، خوا خۆی بەسە کە پاداشتی (چاکەکاران بداتەوەو لە بێ باوەڕانیش بپرسێتەوە)."

بەڵێ، پێغەمبەران(عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ) بۆ بەدیهێنانی مەبەستێکی وا نێررابوون. هەربۆیە سەرجەم ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لەبەردەمیاندا قوت کرانەوە و، ئەو کەسانەش کە لە ڕوویاندا وەستان، کاری لێ نەکردن و بەلایانەوە هیچ بایەخێکی نەبوو. نەیاندەزانی ترس چییە، چونکە هەمیشە لە ترسی خوای گەورەدا بوون.

---

١ - الأنبياء إخوةٌ لِعَلاّت، أُمَّهاتُهُم شتى و دينُهُم واحد. واتە: " پێغەمبەران کۆمەڵە برایەکن، کە باوکیان یەکێکە و دایکیان جیایە. پەیام و دینەکەیان یەکە." واتە پێغەمبەران دەربارەی بناغەی دین (تەوحید) یەکدەنگ و یەك پەیامن، بەڵام لە شەرع و لق و پۆپدا بەرنامەی جیاواز لە یەکتریان هێناوە. البخاري، الأنبياء ٤٨ ـ مسلم، الفضائل ١٤٥.

ئا لەم ڕوانگەیەوە، وەحیی پەروەردگار پێغەمبەرمان دەدوێنێت و دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾
(المائدة: ٦٧)

"ئەی پێغەمبەر و فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیووە لە لایەن پەروەردگارتەوە (بێ دوودڵی، بێ ماتڵی) ڕای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت (بەتەواویی) نەگەیاندووە (دڵنیاش بە کە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی خوا هیدایەت و ڕێنموویی قەوم و هۆزی بێ باوەڕان نادات."

واتە ئەگەر تۆ کەمتەرخەم بیت لەکارەکەتدا ـ کە گەیاندنی پەیامەکەتە ـ ئەوا ئەو کەمتەرخەمییە کەمتەرخەمییەك نابێ کە تەنها پەیوەست بێت بە ژیانی کەسی خۆتەوە، بەڵکو بابەتێکە ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتی هەمووان دەگرێتەوە. چونکە کاری تۆ بریتییە لە ڕووناك کردنەوەی ڕێگای سەرجەم مرۆڤایەتی. خۆ ئەگەر کەمتەرخەمیت کرد و مافی خۆیت پێ نەدا ـ کە هەرگیز شتی وا نەبووە و ناشبێت ـ ئەوا هەموو مرۆڤایەتی لە تاریکیدا دەمێننەوە. لەڕاستیدا پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) زۆر باش دەرکی بە گرنگیی پەیامەکەی کردبوو. خۆ ئەگەر وا نەبووایە، ئەوا هەرگیز بەو ئەرکەوە نەدەنێررا و، ئەو بەرپرسیارێتییەی لە چارە نەدەنووسرا.

## تەبلیغ لای پێغەمبەری خوا

پاش ئەوەی ئەو ئەرکە پیرۆزە بە پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) سپێررا، سەرجەم ژیانی لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکەیدا بەسەر برد. ماڵ بە ماڵ

دەگەڕا و لە سۆراخی دۆزینەوەی کەسانێکدا بوو کە قبووڵ کردنی پەیامەکەی لێ ڕادەبینین.

کاردانەوەی بەرەی نەیار لەسەرەتادا بریتی بوو لە بایەخ پێنەدان و فەرامۆش کردن. پاشان گۆڕا بۆ لاقرتێ و گاڵتە پێ کردن. لە دوا قۆناغیشدا پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی گشت جۆرەکانی زەبر و زەنگ و ئەشکەنجەدان. دڕك و داڵیان فڕێ دەدایە سەر ڕێگاکەی و، کاتێکیش بۆ نوێژ دەوەستا، پاشەڕۆی ئاژەڵانیان بەسەردا دەکرد و هەموو چەشنە بێ حورمەتییەکی پێ ڕەوا دەبینرا. بەڵام پێغەمبەری خوا بە هیچ کام لەمانە، بێ ئومێد نەبوو و ورەی نەڕووخا. چونکە ئەو لە پێناو ئەمەدا نێررا بوو. بۆیە دەبینی تەنانەت چەندین جار سەردانی سەرسەختترین دوژمنەکانیشی دەکرد و پەیامی خوای پێ ڕادەگەیاندن.

بەڵێ، دەبێ چەند جار ڕۆشتبێ بۆ لای دوژمنانی دینی هاوشێوەی: ئەبوو جەهل و ئەبوو لەهەب و، حەق و حەقیقەتی بۆ باس کردبن؟! پێغەمبەر(ﷺ) لەناو بازاڕەکاندا دەگەڕا و بە ئومێدی ئەوەی ببێتە مایەی هیدایەتدانی کەسێك، یەکە یەکەی دەوارەکان دەگەڕا. بەڵام گشت دەرگاکانی بەڕوودا دادەخران. لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرفەتێکی تردا لە هەمان دەرگای دەدایەوە و، هەمان شتی دووبارە دەکردەوە.. کاتێکیش ئومێدی بە مەککە نەما، بەرەو " طائیف " کەوتەڕێ.. طائیف شوێنێکی گەشتیاری و باخ و باخات بوو. ناز و نیعمەتەکانی طائیف خەڵکەکەیی تووشی لووتبەرزی و ڕۆچوون لە ڕابواردندا کردبوو. وەنەبێ هەڵوێستی خەڵکی طائیف لە هی مەککەییەکان جیاوازتر بووبێت، بەڵکو ـ لە مەککەییەکان خراپتر ـ هەرچی کوڕ و کاڵ و هەرزەیان هەبوو، کۆیانکردەوە و دەستیان کرد بە بەرد بارانکردنی ڕەسوولی ئەکرەم. بەڵێ، ئەو پێغەمبەرە نازدارەی کە تەنانەت فریشتەکانیش تێریان نەدەخوارد

له تەماشاکردنی سیمای تابانی و ڕوخساری شیرینی، کەوتە بەر ڕێژنەی بەردی ئەو دڵ بەردینانە و، لە طائیف وەدەریان نا. پێغەمبەری سەروەر لەم گەشتەدا "زەیدی کوڕی حارثە"(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)ی لەگەڵدا بوو. ئەو زەیدەی کە بە "کوڕم" بانگی دەکرد و زۆری خۆشدەویست. هەرچەندە زەید هەوڵی دەدا بە جەستەی خۆی پێغەمبەری خوا لەبارانی بەردەکان بپارێزێ و ببێتە قەڵغان بۆی، بەڵام لاشەی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) چەندین بەردی بەرکەوت و خوێناوی کرا.

پێغەمبەری نازدار لەتاو ئەو هەڵمەتە بێ بەزەییانەیەدا، پەنای بردە بەر باخێك و لەژێر سێبەری دارێکدا ووچانی دا. دەست بەجێ جوبرەئیلی ئەمین لەبەردەمیدا دەرکەوت و پێی ڕاگەیاند کە ئەگەر ئیزن بفەرمووێ، ئا ئێستا ئەو شاخە بەرز دەکاتەوە و بەسەر ئەو دڕندانەدا قولپی دەکاتەوە. بەڵام پێغەمبەری خوا ئەگەرچی زۆریش ئازاری پێگەیشتبوو، وەك ئەو بیری نەدەکردەوە، بۆیە فەرمووی: " نا، نەخێر"

بەڵێ، ئەگەر لە نێو ئەمانەدا ـ با لە داهاتوویەکی زۆر دووریشدا بووایە ـ کەسانێك ئیمانیان هێنابایە، ئەوا بەڕووی بەڵا و سزاکاندا "نەخێر"ی هەڵدەبژارد...

دوای ئەمە دەستی نزای بۆ لای پەروەردگاری بەرز کردەوە و فەرمووی:

اَللّٰهُمَّ إِلَيْكَ أَشْكُو ضَعْفَ قُوَّتِي وَهَوَانِي عَلَى النَّاسِ، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ أَنْتَ رَبُّ الْمُسْتَضْعَفِينَ وَأَنْتَ رَبِّي إِلَى مَنْ تَكِلُنِي؟ إِلَى بَعِيدٍ يَتَجَهَّمُنِي أَمْ إِلَى عَدُوٍّ مَلَّكْتَهُ أَمْرِي. إِنْ لَمْ يَكُنْ بِكَ غَضَبٌ عَلَيَّ فَلاَ أُبَالِي، وَلَكِنْ عَافِيَتُكَ هِيَ أَوْسَعُ لِي. أَعُوذُ بِنُورِ وَجْهِكَ الَّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ الظُّلُمَاتُ وَصَلَحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ مِنْ أَنْ تُنْـزِلَ بِي غَضَبَكَ أَوْ يُحِلَّ عَلَيَّ سَخَطُكَ. لَكَ الْعُتْبَى حَتَّى تَرْضَى وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِكَ

" پەروەردگارا، سکالاّی لاوازی هێز و توانام و، سووکیم لەلای خەڵك تەنها بۆ لای تۆ دێنم. یا أرحم الراحمین، تۆ پەروەردگاری چەوساوە و داماوانی، پەروەردگاری منیشی.. بە کێم دەسپێری؟ بە کەسێکی دوور ڕووم لێ گرژ بکا، یان بە دوژمنێك کە کاروباری منت داوەتە دەستی؟ ئەگەر خۆت لێم تووڕە نەبی، ئەوا گوێ نادەمە ئەو بەلاّ و ئازارانەی دەیچێژم. بەلاّم بێوەیی و لێبووردنت بۆ من گوشاد ترە. پەنا دەگرم بە نووری دیدەت، کە هەموو تاریکییەکانی ڕووناك کردووەتەوە و سەرجەم کاروباری دنیا و قیامەتی لەسەر ڕاوەستاوە، لەوەی کە تووڕەیی و قین و خەشمت بەسەرمدا بباریّ و گرفتارم بکات. هەموو ملکەچییەك هەر بۆ تۆیە تاوەکو ڕازی دەبیت.هیچ هەوڵ و هێزێکیش بەبێ تۆ نابێ."

لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا سەرگەرمی دوعا کردن بوو، بە ئەسپایی یەکێك هاتە پالیان و هێشوویەك ترێی خستە بەردەمیان. کاتێك پێغەمبەری خوا دەستی برد بۆ ترێکە، "بسم الله"ی کرد، پاشان خواردی. ئەمە ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ "عەدداس"ی کۆیلە. بۆیە عەدداس بە سەرسوڕمانەوە وتی: " ئەمە قسەی خەڵکی ئەم ناوچەیە نییە! " لەبەرامبەردا پێغەمبەری خوا فەرمووی: " تۆ خەڵکی چ ولاّتێکی و لەسەر چ دینێکی؟ " وتی: " من مەسیحیم و خەڵکی شاری نەینەوام." پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: " واتە خەڵکی شارەکەی "یونس کوڕی مەتتا" پێغەمبەری." عەدداس بە سەرسوڕمانەوە وتی: " تۆ لەکوێ یونسی کوڕی مەتتا دەناسی؟ " پێغەمبەری خوا لە وەلاّمدا فەرمووی: " ئەو برامە، ئەو پێغەمبەر بووە و منیش پێغەمبەرم." عەدداس لە تاو بیستنی ئەم قسانەدا خۆی پێ نەگیرا و خۆی دا بەسەر و قاچی پێغەمبەری خوادا و کەوتە ماچکردنی... بەڵێ، ئەوەی چەندان ساڵە بەدوایدا وێڵە، ئێستاکێ و بە چەشنێك کە هەرگیز بە خەیاڵیدا

نەدەهات، لە بەرامبەریدا دانیشتووە... عەدداس ئەم هەلەی لەدەست نەدا و ئیمانی هێنا.[1]

خۆ ئەگەر ئەم ڕووداوەی دوایی نەبووایە، ئەوا پێغەمبەری خوا بە دڵتەنگی و پەژارەوە لە طائیف دەگەڕایەوە. نەك لەبەر ئەو ئازارانەی کە چەشتی، بەڵکو لەبەرئەوەی هەلێکی بۆ نەڕەخسا تاکو بانگەوازەکەی بە هیچ کەسێکیان بگەیەنێت. بەڵام ئێستا لە خۆشییاندا باڵی گرتووە، ئەوەتا عەدداس لەسەر دەستی هیدایەتی وەرگرتووە. بەڕاستی سەرداری پێغەمبەران هەرگیز خاو نەدەبووەوە لە گەڕان بەدوای ئەو دڵ و سیما پاکانەی کە بۆ حەقیقەت کراوە بوون. هەر کە دەشیدۆزینەوە یەکسەر دەچووە ناو ناخیانەوە و ئیلهامەکانی ڕۆحی بەسەردا پەخش دەکردن. بەم شێوەیە تریفە پرشنگدارەکەی دەوری، ڕۆژ دوای ڕۆژ فراوان دەبوو و، هەر فراوان بوونێکیش ڕق و کینەی کوفری ئەستوورتر دەکرد و بەرەو شێتیی دەیبردن. هەروەك چۆن ئەمڕۆ کوفر لەبەردەم بێداربوونەوەی موسوڵمانانداندا لەخۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهاندا، وەك شێتی لێ هاتووە و خەریکی وڕێنە کردنە.

ئەم شێتیە، باوەڕێکی وای لا دروستکردن، ڕۆژ هات وەك ئەوەی بیانەوێت بە فووی دەم خۆری ئاسمان بکوژێننەوە، ئاوها بەیەکجار ویستیان ئەم مەشخەڵە ئیلاهییە بکوژێننەوە. بەڵام هەیهات..! خۆر لێرەدا تەنها ئامرازێکی لێکچواندنە.. ئەگەرنا ئەو نوورەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناویەتی بەجۆرێکە، ڕووناکی خۆر خامۆش دەکات. چونکە ئەو نوورە،

١ - إبن سعد، الطبقات الكبرى ١/٢١١-٢١٢ ـ إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٦٦-٢٦٩ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ١٣٦/٣... چەند بەشێکی ڕووداوەکە لە: البخاري، بدء الخلق ٧ ـ مسلم، الجهاد ١١١ یشدا هاتووە.

نووری خوای گەورەیە. قورئانی پیرۆز ئەم حاڵە پێکەنیناوییەیان بەم شـــێوەیە وێنا دەکات:

﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ (التوبة: ٣٢)

" (ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچانەیانەوە) دەیانەوێت نوور و ئاینی خوا بە دەمیان بکوژێننەوە و خامۆشی بکەن. (بەڵام خەیاڵیان خاوە)، خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت نووری خۆی تەواو بکات و ئاینەکەی سەربخات، هەرچەندە کافر و بێ باوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن."

لەم سەردەمەی خۆشماندا چەند پزیسکێك لەو مەشخەڵەی پێغەمبەری خوا دایگیرساندووە، دەروونی ئێمەی تاوداوە و، سەدان هەزار کـەس وەك پەروانـە بوونەتە ڕێبواری ئەم ڕێگەیە و، گیان لەسەر دەست لە پێنـاوی بەرزکرنـەوەی بانگەوازەکەیدا سەرگەرمی خزمەتن. کە وابێ خوای گەورە ویستـی وا بــووە ئەو ڕەهێڵە موحەممەدیە سەر لەنوێ ببارێتەوە و، ئەو زنجیرە زێڕینـەش هـەر بەردەوام بێ. لەبەرامبەر ئەمەشدا نە ڕق و توندوتیژیی کوفر و، نـە شـالاوی سوپاکانی شەیتان نەتوانن بەری لێ بگرن و کاروانەکەی ڕابگرن. بـەڵێ، ئـەو تۆوانەی بە ئیخلاسەوە چێندراون، زوو بێ یان درەنگ، هەر سەوز دەبن و، ئەو نوورەی پێغەمبەری خوا پەخشی کردووە هەرگیز خامۆش نابێت.

کاتێك مەککە چی تر نەیتوانی پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) لە ئامێز بگرێ، کۆچی کرد بۆ مەدینە تاکو لەوێ بەردەوام بێ لە بڵاوکردنەوەی نوور و هیدایەتــدا. بــەڵام لــەوێ دەبوایــە خــەریك بــێ لەگــەڵ جوولەکــە و مونافیقەکانیشدا، سەرکردایەتی جەنگ بکات دژی کافران و، ددانی پـیرۆزی

بشکێ و ڕوومەتی خوێناوی ببێت و دووچاری برسێتی و تینوێتی ببێتەوە. تەنانەت زۆر جار برسێتی تەنگی پێ هەڵدەچنی و لەتاوا بەردی بە سکیەوە دەبەست. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بۆ ساتێکیش ئەرکی تەبلیغی فەرامۆش نەکرد. سەرجەم لایەنەکانی دین، تا دەگاتە بچووکترین مەسەلە، هەمووی ڕوون کردەوە و گەیاندی. بە درێژایی مانەوەی لە مەدینەی مونەووەرەدا و، وێڕای دەستەویەخە بوونی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا، کەچی هەرگیز ئیرشادی تاکەکانی پشتگوێ نەخست. جاری وا هەبوو عەرەبێکی دەشتەکی دەهاتە خزمەتی و پرسیارێکی لێ دەکرد، کە پێشتر سەدان جار وەڵامی دابووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە شەوق و تاسەوە وەڵامی دەدایەوە و هەرگیز بێزاریی دەرنەدەبڕی.

تەبلیغ واتە ڕێنمایی کردنی خەڵکی بۆ سەر ڕێگەی ڕاست - کە ئەمەش مەبەست و حیکمەتی ناردنی پێغەمبەران و ڕەوانەکردنی سوڵتانی پێغەمبەرانە ـ ئەو ڕێگە ڕاستەی کە تێکڕای ئیمانداران ئاشنان پێی و پێویستیشە باش شارەزای بن. ڕۆژانە زیاتر لە چل جار داوا لە خوا دەکەین کە هیدایەتمان بدات بۆ ئەو ڕاستەڕێیەی کە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان گرتوویانەتە بەر و، وەك ئەوان بمانگەیەنێت بە مەبەست و نیازی خۆمان. ڕێگەی ڕاست، ڕێگەیەکی پان و بەرینە و هەموو کەسێك بەشی خۆی تێدا هەیە، چونکە خاتەمی پێغەمبەران(ﷺ) ڕەحمەتە بۆ سەرجەم جیهانیان.[1]

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) شایەت و مژدەدەر و ئاگادارکەرەوەشە. هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی کردووە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ (الأحزاب: ٤٥) " ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بە ڕاستی

١ ـ سورة الأنبياء: ١٠٧

ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە وەک شایەت و مژدە بەخش و ئاگادارکەرەوە."

پێغەمبەری خوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیست و سێ ساڵی ڕەبەق بەرپرسیارێتییەکی سەنگینی وەك پێغەمبەرایەتی هەڵگرت و بە سەرکەوتووییەکی بێوێنە کە بۆ هیچ خاوەن بانگەوازێکی تر نەڕەخساوە، فەرمانبەریی سەر شانی بە پایان گەیاند. بەم جۆرەش، ئاوێتە لەگەڵ ئەم هەست و ڕۆحیەتەدا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە " کۆتاییە پیرۆزەکە" نزیك دەبووەوە.

پێغەمبەری خوا حەجیماڵئاوایی (حجة الوداع) ئەنجام دەدا - خۆ لە تەمەنی موبارەکیشیدا تەنها یەك حەجی کردووە - ئێمە لە هەمان کاتدا بەم حەجە دەڵێین "الحج الأكبر"، چونکە پێغەمبەری ئازیزمان تیایدا حەج و عومرەی هەردوو پێکەوە ئەنجام دان.[1] جا ئیتر لەو کۆتا حەجەدا پێغەمبەری خوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سواری وشترەکەی بوو و ئەوەی پێویست بوو ڕایبگەیەنێ جارێکی تر تەبلیغی کردەوە. بەڵێ، هەر لە حوکمی کوشتن، خوێن و مافی ئافرەتەوە، تا دەگاتە باسکردنی سوو، پەیوەندی نێوان تیرە و هۆزەکان، هەموو شتێکی باسکرد. جارێکی تر هەموو ئەمانەی پێ گەیاندنەوە و، لە هەر جارێکیشیاندا ڕووی دەکردە کۆمەڵی ئیمانداران و، پێی دەوتن: أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟ " ئایا گەیاندم؟ " ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە: " بەڵێ شایەتی دەدەین کە گەیاندت و، ئەنجامت دا و ئامۆژگاریت کرد." ئەویش بە پەنجەی موبارەکی ئاماژەی دەکرد بۆ ئاسمان و شۆڕی دەکردەوە بۆ سەر خەڵکەکە و سێ جار

---

١ - الحج الأكبر: هەندێك لە زانایان ئەم ناوەیان لە حەج ناوە، بە گوێرەی هەندێکی تریشیان بریتییە لە ئەنجامدانی حەج و عومرە پێکەوە. بە هەڵە لەنێو خەڵکیدا بەو حەجە دەوترێت کە تیایدا عەرەفات بەر ڕۆژی هەینی دەکەوێت.

دەیوت: : اَللهُمَّ اشْهَدْ. " خوایە بە شایەت بە." [1]

لەڕاستیدا فەخری کائینات ئەرکەکەی بە کاملّی و تێروتەسەلی بەئەنجام گەیاند و بەباشترین شێوە تەبلیغی کرد. بۆیە ویژدانی ئاسوودە و، دەروونی گوشاد و، دلّی بێخەم بوو و هەنگاو بە هەنگاو خۆی بۆ دیداری پەروەردگاری ئامادە دەکرد. ئەو مەردی موراقەبە (چاودێری کردنی ورد و لێپێچینەوەی توندی نەفسە لە ورد و درشتی کاروبارەکانیدا) بوو و، سەرتاپای ژیانی لە چوارچێوەی ئەو چاودێرییە هەستیارەدا بەسەر برد. لە خۆی دەپرسی: " ئەرێ دەبێ توانیبێتم ئەو ئامانجە بەدیبهێنم کە خوای گەورە لە پێناویدا منی بۆ خەلّکی ڕەوانە کردووە؟ "

## ٣- سەرمەشق و نموونەی چاك

لایەنێکی تر کە دەکرێ سەبارەت بە حیکمەتی ناردنی پێغەمبەران باسی بکەین، ئەوەیە کە ببنە نموونە و پێشەنگ تا ئوممەتەکانیان چاویان لێ بکەن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان دەکات: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ﴾ (الأنعام: ٩٠) " ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا (بە تایبەت) هیدایەت و ڕێنموویی کردوون. تۆش (ئەی محمد (صلی اللە علیە وسلم)، شوێنی هیدایەت و ڕێنموویی ئەوانە بکەوە."

جا بیر بکەنەوە! ئەم ئایەتە پاش ناوهێنانی پێغەمبەرانی پێش خۆی، ڕوو دەکاتە پێغەمبەرمان و ئامۆژگاری دەکات، کە شوێن پێغەمبەرانی پێش

---

١ - مسلم، الحج ١٤٧ ـ أبو داود، المناسك ٥٦ ـ إبن ماجە، المناسك ٧٦، ٨٤.

خۆی بکەوێت.

لە لایەکی ترەوە قورئانی پیرۆز ڕوو دەکاتە ئێمە و پێمان ڕادەگەیەنێت کە: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾ (الأحزاب: ٢١) " سوێند بە خوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێک و پێک هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازیی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن."

پێغەمبەران(ﷺ) ئیمام و ڕابەری کامڵن بۆمان. هەروەك چۆن لە نوێژدا شوێن ئیمام دەکەوین، ئاوهاش لە گشت بوارەکانی ژیانماندا ئاکاری پێغەمبەران دەکەینە سەرمەشق و شوێن پێیان هەڵدەگرین. چونکە بەش بەحاڵی خۆمان ژیانی ڕاستەقینە لە سایەی پێغەمبەری پێشەوا و پێغەمبەرانی ترەوە بەدی دەکەین. ئەو هاوەڵانەش کە لە سەردەمی پێغەمبەرماندا ژیاون، ملیم بە ملیم شوێنی کەوتن و جێ پێیان هەڵگرت. هەربۆیە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیشیان گەیشتنە ئەو مەنزڵەی کە فەرموودەکە باسی دەکات:

" ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکدا دێت، کۆمەڵێك لە خەڵکی غەزا دەکەن و پێیان دەوترێ:

- ئەرێ لەناوتاندا کەس هەیە شەرەفمەندی دیداری پێغەمبەری خوا بووبێت؟

- جا کە دەڵێن: " بەڵێ" بەوە فەتحی ئەو ناوچەیەیان بۆ ئاسان دەکرێ.

پاشان کۆمەڵێکی تر لە خەڵك غەزا دەکەن و پێیان دەوترێ:

- ئایا کەستان تێدایە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوای دیبێ؟

- ئەوانیش دەڵێن: " بەڵێ" بەوە ئەو ناوچەیەیان بۆ فەتح دەبێ. پاشتر کۆمەڵێك لە خەڵك غەزا دەکەن و پێیان دەوترێ:

- ئایا کەستان تێدایە هاوەڵێتی ئەوانەی کردبێ کەوا ئەصحابەی پێغەمبەریان دیوە؟

- دەڵێن: " بەڵێ" ئیتر دەروازەی قەلاکان بۆ ئەوانیش دەکرێنەوە و ئەو ناوچەیەش فەتح دەکەن."[1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەفەرمایشتێکی تردا دەفەرموێ:

خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. [2]

" باشترین خەڵك ئەوانەی سەردەمی منن، پاشان ئەوانەی دوای ئەمان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن."

ئەم فەرموودەیە ئاماژە بە فەزیلەتی ئەو سەردەمانە دەکات کە لە پێغەمبەری خواوە نزیکن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان هەستیارییەکی بێ وێنەیان دەنواند تا ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە ژیانیان هاوشێوەی ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت. لە ڕاستیدا خۆچوواندن بە مرۆڤێك کە پەروەردگاری زەمین و ئاسمان بە نموونە و پێشەنگ هەڵی بژاردووە، شایانی ئەوە بوو بکرێتە خولیا و ئامانجی ژیان. هەروەك بە ڕاستیش وا بوو...

ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین لەم بابەتەدا زۆر وردەکار و هەستیار بوون. هەر بۆیە ئەوان لەم ڕووەوە لە مرۆڤی سەردەمەکانی تر بە باشتر دادەنرێن. بەڵێ، حەزرەتی موسا(عَلَيْهِ السَّلَامُ) مەبەستی ئومەتی حەزرەتی

---

١- البخاري، فضائل الأصحاب ١ ـ مسلم، فضائل الصحابة ٢٠٨-٢٠٩.

٢ ـ البخاري، فضائل الأصحاب ١ ـ مسلم، فضائل الصحابة ٢١٠-٢١٦.

موحەممەد بوو کاتێ دەیفەرموو: " ئالآی قودسییەکانیان لەدەستدایە." [1]
ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕێزلێنانێکی گەورە بوو. پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا، هەرچەندە لاوازیش بێت، دەفەرموێ: عُلَمَاءُ أُمَّتِي كَأَنْبِيَاءِ بَنِي إِسْرَائِيلَ. [2] " زانایانی ئوممەتەکەم وەك پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلن." ئەمەش دەبێتە بەڵگەیەك لەسەر پلە و پایەی ئوممەتی موحەممەد موستەفا(عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ).

ئەوان بە پابەندبوونیان بە پێغەمبەری خواوە، گەیشتن بە پلەیەك کە تۆزێك لەولاترەوە سنووری پێغەمبەرایەتی دەستی پێ دەکرد. حەزرەتی عومەر(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) نمونەیەکی پرشنگداری ئەو جۆرە پیاوانەیە کە پێغەمبەری خوایان کردبووە سەرمەشق و، ژیانیان بە شوێنکەوتەیی ئەو پێشەوا مەزنە ڕازاندبووەوە. ئەوەتا ببینە لەپاش ئەوەش کە دەوڵەتان کەوتنە ژێر دەستی و، ئیمپراتۆریەتەکان لەسەر دەستی فەتح کران، کەچی ئەم تاڵە موویەك لە تەرزی ژیانی خۆی نەگۆڕی. "قودس"ی خەمبار و دیلی ئەمڕۆ ـ کە پەڵەیەکی ڕەشە بە نێو چاوانی جیهانی ئیسلامییەوە ـ لە سەردەمی ئەودا فەتح کرا. ئەگەر چی موسوڵمانان شارەکەیان فەتح کردبوو، کەچی قەشە و ڕاهیبەکان پێداگرییان دەکرد و، ئامادە نەبوون کلیلی شارەکە تەسلیم بکەن و دەیانووت: " وەسف و تایبەتمەندیەکانی ئەو کەسە نابینین لە ناوتاندا کە کلیلی شارەکە وەردەگرێت."...

جا کاتێك هەواڵەکە گەیشتەوە حەزرەتی عومەر، خێرا وشترێك لە "بیت

١ـ العهد القديم، التثنية، الباب: ٣٣، ڕستەی ٣.
٢ـ العجلوني، كشف الخفاء ٢/٨٣.

المال" قەرز دەكات و لەگەڵ خزمەتكارەكەیدا كە بە نۆرە سواری دەبوون، كەوتنە ڕێ تا گەیشتنە قودس. جیلوەی قەدەر وا بوو كاتێك دەچوونە ناو شارەكەوە، نۆرەی خزمەتكارەكەی بێت سواری وشترەكە ببێت. خەلیفە سەرەڕای هەموو تكا و پێداگریی خزمەتكارەكەی، لە وشترەكە دادەبەزێ و جڵەوی وشترەكە دەگرێتە دەست و بەم حاڵەوە دەچێتە ناو شارەكەوە...

كاتێك خەڵكی شارەكە ئەم دیمەنە دەبینن، مۆم ئاسا دەتوێنەوە و بەیەك دەنگ دەڵێن: " بەڵێ، ئەمە ئەو كەسەیە لە كتێبەكانماندا باسی هاتووە."

ئینجا سەرنج بدە لە حاڵی پاش ئەوەی كە كابرای مەجوسی خەنجەرەكەی لێدەدات و بەبێ هۆشی لە جێگادا دەكەوێت. زامەكەی هێندە سەخت بوو، هەرچییەكی دەخوارد لە برینەكەیەوە دەهاتە دەرەوە. نە هیچ دەنگێكی لێوە دەهات، نە بە دەنگەكانی دەوروبەریشی بە ئاگا دەهات. كاتێك خزمەتكارەكەی دەهات تا بزانێ هیچ دەخوات یان نا، هیچ وەڵامێكی نەدەدایەوە، یان بە چاوی ئاماژەی"نەخێر"ی دەكرد. بەڵام هەر كات پێیان دەوت: " ئەی ئەمیری ئیمانداران، نوێژ" یەكسەر بەئاگا دەهاتەوە و دەیفەرموو: " ها ئەوە هەستام. هەر كەس واز لە نوێژ بهێنێت، لە ئیسلامدا بەشی نییە." ئیتر بەو حاڵەوە و بە جەستەی بریندار و خوێناوییەوە نوێژەكەی دەكرد.[1]

بەڵێ حەزرەتی عومەر بەو جۆرە بوو... چونكە لە سەروەر و خۆشەویستەكەیەوە وا فێر ببوو. بۆیە شوێن پێی رسول الله ی هەڵدەگرت و، بەم جۆرەش دەبووە سەرمەشق و نموونە بۆ ئەوانەی لە دوایەوە دەهاتن. بەڵێ، یەكێك لە حیكمەتەكانی ناردنی پێغەمبەران ئەوەیە ببنە پێشڕەو و ڕابەری چاك بۆ ئوممەتەكانیان.

---

١- عبدالرزاق، المصنف ١/١٥٠ ـ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣/٣٥٠

## ٤ـ دابینکردنی هاوسەنگی لە نێوان دنیا و قیامەتدا

هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون هاوسەنگی لەنێوان دنیا و قیامەتدا دابین بکەن. لە سایەی ئەو هاوسەنگییەشدا، مرۆڤایەتی لە زیادەڕەوی و کورتبڕی ( الأفراط و التفریط) ڕزگاری دەبێ و ئیستیقامەت بەدەست دەهێنێت.

بەڵێ، دروست نییە مرۆڤ وەك راهیبەکان بە تەواوی واز لە دنیا بهێنێت و خۆی بخزێنێتە کونجی پەرستگاکانەوە. هەروەك ناشبێت ڕۆبچێت بە دنیادا و ببێتە کۆیلەی دەستی ماددە. بەڵکو هاوسەنگی لە پەیڕەو کردنی ناوەندەڕێ دایە. ئەمەش تایبەتمەندییەکە، تەنها و تەنها لە دنیا ڕووناکەکەی "وەحی"دا بەدەست دێ. ئەگەرنا عەقڵ و ویژدان دەستەوسانن لە بونیاتنانی وەها هاوسەنگییەکدا. ئاشکرایە کە زانستی ڕووتیش ناتوانێ مرۆڤ بەرز بکاتەوە بۆ ئەو ئاستە.

قورئانی پیرۆز بەم جۆرە باس لەم هاوسەنگییە دەکات:

﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ (القصص: ٧٧)

" هەوڵبدە بەو شتانەی خوا پێی بەخشیووی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕە و بەشی خۆشت لە دنیادا بە حەڵاڵی فەرامۆش مەکە. چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەک خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت. نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناح و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن."

جـا ئەگەر تايەكى ئەم تـەرازووە ئيلاهييە، حەقيقەتى ئـــايەتى پيرۆزى: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ (الضحى: ١١) " دەربـــارەى نـــاز و نيعمەتـــەكانى پەروەردگارت هەميشە بدوێ و، لە جێى خۆياندا بەكاريان بهێنـە." بێـت، ئـەوا تاكەى ترى، ناوەڕۆكى ئـەو ئاگـادار كردنەوەيـە كـە ئايـەتى پـيرۆزى ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾ (التكاثر: ٨) "سوێند بە خوا، لـەو ڕۆژەدا پرسـيارتان لێ دەكرێت دەربارەى هەموو ناز و نيعمەتەكان." گوزارشتى لێ دەكات.

حەزرەتى ئەبووبەكرى صيدديق(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) چەند نمونەيەكى پرشنگدارە لەم بوارەدا! حەزرەت هەموو ماڵ و سامانەكەى لە پێناوى خوادا بەخـەرجى دا و هيچى لێ نەهێشتەوە. ئاخر مەقامى "صـيدديقيەت" ئەمـەى دەخواسـت. جارێكيان لە سەردەمى خەلافەتيدا پەرداخێك ئاوى ساردیان بۆ هێنا، ئەويش خواردیەوە و بەدويدا دايە پرمەى گريان. هێندە گريا تا ئەوانەى دەوروبەريشى خستە گريان. تەنانەت كاتێك گريانەكەشى بڕى، ئەوان هەر دەگريان- لەوانەيە تاوێكيش بۆ گريانەكەى ئەوان گريا بێت ـ پاشان كە ڕوخسارى سڕى و هاتەوە سەر خۆى، ئامادەبوانى مەجليسەكە پرسيان: " ئەى جێنشـينى پێغەمبـەرى خوا چى بوو تۆى ئاوا هێنايـە گريـان؟ " ئـەويش لـە وەڵامـدا فـەرمووى: " جارێكيان لە خزمـەت پێغەمبـەرى خـوادا بـووم، وەك ئـەوەى بـە دەسـتى موبارەكى شتێك لە خۆى دووربخاتەوە، هـەر دەيـووت: 'دووركـەوەوە لـێم.. دووركەوەوە لێم.' منيش هيچم نەدەدى. بۆيە پرسيم: ئەى پێغەمبەرى خـوا، دەبينم شتێك لە خۆت دوور دەخەيتەوە و منيش هـيچ شـتێ بـەدى ناكـەم. پێغەمبـەرى خـواش فـەرمووى: ' ئـەوە دنيـا بـوو، بـە هـەموو كـەيف و خۆشييەكانى ناويەوە خۆى بۆ نواندم، دەيويست خۆيم لا پەســەند بكــات. منــيش پـێم وت: ( دووركــەوەوە لــێم ) ئـيتر بـەدەم دووركەوتنەوەيـەوە دەيوت:'سوێند بە خوا، ئەگەر تۆش ڕزگارت بێ لەدەستم، ئەوانەى دواى تـۆ

ناتوانن لەدەستم دەرچن.٥ جا لە ترسی ئەوەی دنیا بەم پەرداخە ئاوە خۆی لا پەسەند کردبێتم، گریام."[1]

بەڵێ، ئەو و ئەوانەش کە وەك ئەو بوون، سەرەڕای ئەوەی دەروازەکانی خۆش گوزەرانیان بۆ خرابووە سەرپشت و دنیا بە ڕوویاندا بزەی دەکرد، کەچی هەمیشە ژیانیان لە نێو هاوسەنگیدا بەسەربرد. جا خۆ سەرمەشقی هەمووان، ڕابەری هەرە کامڵ، حەزرەتی حبیب الله ش هەروا ژیابوو.[2]

## ٥. داخستنی دەرگای بڕو بیانوو

پێغەمبەران(عَلَيۡهِمُٱلسَّلَامُ) بۆ ئەوە نێرراون تاوەکو لە ئاخیرەتدا مرۆڤەکان لە حزووری پەروەردگاردا هیچ پەڵپ و بیانوویەکیان بۆ نەمێنێتەوە.

خوای گەورە ئەم مەبەستە ڕوون دەکاتەوە و، دەفەرموێ:

﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء: ١٦٥)

" پێغەمبەرانمان (ڕەوانە کردووە) کە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ (یاخییەکان)، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت (لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان) دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، بێگومان هەمیشە و بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە."

سەرکردە و پێشڕەوانی مرۆڤایەتی، لە دەرەوەی پێغەمبەران، هەرگیز

---

١- البزار، المسند ١/١٠٦، ١٩٦ ـ الحاكم، المستدرك ٣٤٤/٤ ـ البيهقي، شعب الأيمان ٣٤٣/٧، ٣٤٥.

٢ - بۆ نموونە بڕواننە: مسلم، الأشربة ١٤٠-١٤٢.

نەیانتوانیوە تا سەر بەردەوام بن لەسەر قەناعەت پێ کردن و ئاراستە کردنی کۆمەڵگەکانیان. ئەگەر بۆ ماوەیەکیش کاریگەرییان هەبووبێت، ئەوا کاتیی بووە و لەگەڵ هاتنی خەزاندا گەڵاکانیان بەملاولادا پەرش و بڵاو بوونەتەوە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بێ بەش بوونی بانگەوازەکانیان لە ئاسمانی بوون و کۆمەکی خوایی. هەربۆیە لە هیچ کام لە بیرکردنەوە و هەنگاوەکانیاندا، نەیانتوانیوە چوارچێوەی سروشتی ئادەمییانە تێپەڕ بکەن، کە لە بنەڕەتدا ئاوێتەیە بە نەزانی و کورت بینی و هەوەسبازی.

بەڵام پێغەمبەران پێچەوانەی ئەمەن. ئەوان کەسانێکن هەر لە سکی دایکیانەوە هەڵبژێراون و ئامادەکراون بۆ ئەرکی پێغەمبەرایەتی. ژیانیان چەشنی کۆپلەیەکی مۆسیقی و، قسەشیان هاوشێوەی پارچەیەکی شیعری لە یێکەوە گونجان و هاوئاهەنگیدایە. کاتێك ئەوان دێنە گۆ، گەردوون سەرتاپا دەبێتە گوێ و گوێبیستی ئەوان دەبێ. بەڵێ، بە تەشریف هێنانی ئەوان چەندەها ڕووداو ڕێگەی کاروانیان دەگۆڕن و چەندین دڵیش جڵەوی خۆیان ڕادەستی ئەوان دەکەن. یاسا گەردوونییەکان هەندێك جار لەبەر خاتری ئەوان لەکار دەکەون و، هەندێ جاری دیش، لەسەر داوای ئەوان ڕێڕەوی خۆیان دەگۆڕن...

جا با تەماشایەکی ئەو سوڵتانی ئەنبیایە بکەین. ئەوەتا خاك و خۆڵ، دارو بەرد و، زیندەوەرە جۆربەجۆرەکان وەك ئەوەی هەریەکەیان نماینەدەی "جۆر"ەکەی خۆی بێت، دەهاتنە خزمەتی و تەصدیقی نبووەتەکەیان دەکرد. هەروەك "بوصیری"یش دەڵێ:

جَاءَتْ لِدَعْوَتِهِ الْأَشْجَارُ سَاجِدَةً [1]

چونکە هەرچی شتە بە تەشریف هێنانی ئەو زاتە واتای بۆ گەڕایەوە و

---

١- البصيري، ديوان البصيري ٢٤٤.

گەردوونیش لە بێهودەیی و شپرزەیی ڕزگاری بوو. بەدەم خوێندنی ئایەتی: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الإسراء:٤٤) " هیچ شتێک نییە لەم بوونەوەرەدا تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستایشی ئەو شتانە تێناگەن." وەك بلێی فووی ژیانەوەی بە بەری بونەوەراندا دەکرد. بەڵێ، هەرشتێك ئێمە بیزانین، سەرچاوەکەی ئەوە و لەوەوە فێربووین. هەموو شتانیش لە سایەی ئەودا لەسەر تەختی حیکمەت گیرسانەوە.[1] بێگومان لەم نێوەندەشدا مرۆڤ دەرکی بەوە کرد کە بە خۆڕایی و بۆ خۆڕایی دروست نەکراوە.[2]

لەڕاستیدا هەریەك لە پێغەمبەران(عليهم السلام) بەکۆمەڵێك موعجیزەوە هاتوون، تاوەکو خەڵکی باوەڕیان پێ بهێنن و، بڕوبیانووی ئەوانەش بـبڕن کـە ئیمـان ناهێنن. بەڵام ئەوە سەرداری پێغەمبەرانە(ﷺ) کە بـە مـوعجیزەی سـەرجەم

---

١- ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٥١) " هەر وەکو (بۆ تەواو کردنی نازو نیعمەتم) لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لە خۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و حیکمەت و دانایتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی." هەروەها بڕوانە: (البقرة: ١٢٩)، (ال-عمران: ١٦٤)، (الجمعة: ٢)، أحمد بن حنبل، المسند ٢٠٢/١ (ئەو وتووێژەی لە نێوان حەزرەتی جەعفەر و نەجاشیدا ڕوویدا.)

٢- ئەم ئـایەتانە چـەند بە جوانی ئەم بـابەتە ڕوون دەکەنەوە: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ (القيامة: ٣٦) " ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی (لێپرسینەوەی نابێت؟! " ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ (المؤمنون: ١١٥) " ئایا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست کردووە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟! "

پێغەمبەرانی پێش خۆیەوە هاتووە و سەلماندوویەتی کە پێشەنگی هەموانە. هەموو ئوممەتێك موعجیزەی پێغەمبەری خۆیان دیووە یان بیستووە. دیارە ئێمەش هەزاران موعجیزەی پێغەمبەری سەروەرمان بیستووە. موعجیزەیەکی ئەبەدی وەك قورئانی پیرۆزیش هەمیشە لە پێش چاوماندایە. کەواتە کەس بیانووی بۆ نەماوەتەوە و، هیچ کەسیش مافی ڕەخنەی نەماوە. ئەو ڕاستیانەش کە خوای گەورە فەرمانی باوەڕهێنانی پێکردووین، بە ڕوونترین شێوە لە لایەن پێغەمبەرەکەیەوە ـ کە خوای گەورە هەمووکات پشتیوانیەتی ـ بۆمان ڕوونکراوەتەوە. ئەمەش یەکێکە لە مەبەستەکانی نێرڕانی ئەوان. ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الإسراء: ١٥) " سزای کەسمان نەداوە هەتاوەکو پیغەمبەرێکی بۆ نەنێرین."

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دانانی تەرازووی حیساب و، لێپرسینەوەی مرۆڤەکان بەبێ گوێدانە هیچ بیانوویەك، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە.

## ب ـ تایبەتمەندیی پێغەمبەران

### ١ـ ڕەببانییەت

هیچ پێغەمبەرێك لە ئاکامی بیرکردنەوە و خەباتی هزریی خۆیەوە دەستی نەکردووە بەم کارە و، پلانسازیی ئەوەی نەکردووە کە: با سیستەمێکی لەم جۆرە دابڕێژم، وە ناشیکات. بەڵکو ڕاستەوخۆ خوای گەورە خۆی کەسێکی دیاریکراو لەناو مرۆڤەکاندا هەڵدەبژێرێ تا بیکاتە پێغەمبەر. جا کە وەختی هات، ئەرك و بەرپرسیارێتی نبووەت بەم مرۆڤە بژاردەیە ـ کە تەنها بۆ ئەم

مەبەستە بەدی هێنراوە ـ ڕادەگەیەنرێت. ئەویش پێغەمبەرایەتییەکەی ڕادەگەیەنێت. بەڵێ، هەموو پێغەمبەرێك ـ هەریەکەو بە گوێرەی ئاستی خۆی ـ بە وەحییەوە دێت و بە وەحییش دەژی. جا کاتێك وەحی کۆتایی پێدێت، کۆتایی بە ژیانی ئەویش دێت. ئاو و هەوا و توخمە بنەڕەتییەکانی تر چی بن بۆ بەردەوام بوونی زیندەگی ئێمەی مرۆڤ، "وەحی"یش بۆ پێغەمبەران ئەوەیە. دەڵێی سروەی" أُنس بـالله"(دۆستایەتی و هـۆگریی لەگـەڵ خـودا) خـۆراکی گیانی ئەوانە. هەردەم لە فەیزی ئەقدەس و موقەددەسەوە، شتانێك بەوێنەی شەماڵ بەسەریاندا هەڵدەکا و، چەندێکیش ئەو شەماڵە بەرەو ئەوان شنەی بێت، ئەوەندە لەناو خەڵکیدا دەمێننەوە. جا هەرکات ئەو شەماڵە بڕا، ئەوانیش بەتاسەی لیقای پەروەردگارەوە باڵەفڕێ دەکەن و دەکەونە چاوەڕوانیی ئەو ساتەی کە بەرەو "ئەودیو"ەکان دەفڕن. پێغەمبەران کەسانێکن هەموو بوونێکی خۆیان سپاردووە بە خـوا(سُبْحَانَهُوَتَعَالَىٰ). هـەرگیز لەخۆیانەوە قسە ناکەن، بەڵکو تەنها ئەوە دەدرکێنن کە خواستی پەروەردگارە و، هـەر بەو شێواز و چۆنیەتییەش کە خوای گەورە ویستی لەسەرە. جا لەبەر ئەوەی ئەو دینەی هێناویانە، بە تەواوەتی لە لایەن خوای گەورەوە دانراوە، ئەوا ئەوان لە ئەرکەکەیاندا ڕەببانین و، بەجێ گەیاندنی ئەرکێکی ڕەببانی لەم جۆرەشیان لە ئەستۆ نراوە.

لەسەروبەندی جێبەجێکردنی ئەرکەکەشیاندا، هەڵوێستی بەرامبەرەکەیان، قبووڵ کردن بێت یان بەرپەچدانەوە، کار لەوان ناکات و لە ئاراستەی خۆیان لایان نادات. بەڵێ، ئەرکی ئەوان تەنها بریتییە لە تەبلیغ و ڕوونکردنەوە. هەرچی کردە و گوتەی نەیارەکانیشیانە، لە دەرەوەی بازنەی گرنگی پێدانی ئەواندایە. سازش کردنیش لە پەیامەکانیان، مەحاڵێکە بە خەیاڵیشدا نایەت. ناوەڕۆکی ئەم هەڵوێستەش: " ئەگەر خۆر بخەنە دەستی لای ڕاستم و مانگیش

لای چەپم، بۆ ئـەوەی واز لـەم کـارە بهێـنم، سـوێند بـەخوا واز نـاهێنم."[1] دەستووری هەمیشەیی هەموویانە.

## ٢- بۆ خوا لێ بڕان

پێغەمبەران لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیاندا، چـاو نابڕنـە هـیچ پاداشت و بەرامبـەرێك، چ ماددی بێت یان مەعنەوی. قورئانی پیرۆزیش لـە چەندین ئایەت و بۆنەی جیـاوازدا تیشـك دەخاتـە سـەر ئـەم بابەتـە. بۆیـە دەبینیت دروشمی یەکگرتووی هەموو پێغەمبەران بریتییە لە: ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾ (یونس: ٧٢) " پاداشتی من لەسەر خودایە."[2]

ئێمەی مرۆڤگەلی ئاسایی، ئەگەر لە چاوەڕوانیی پاداشـتێکی ماددیشـدا نەبین، بە جۆرێك لە جۆرەکـان چـاو دەبڕینـە پاداشـتێکی مەعنـەوی. بـەڵام پێغەمبەران چاوەڕێی ئەوەش ناکەن. چونکە تاکە پاڵنەر و بزوێنەری سەرجەم کردارەکانیان، فەرمانی خوای گەورەیە. واتە بـەبێ چـاوەڕوانی کردنـی هـیچ ئەنجام و پاداشـتێك و تـەنها لـە ڕوانگـەی ڕاپەڕانـدنی ئـەمری ئیلاهییـەوە ئەرکەکانیان بەجێ دەهێنن. گریمان ـ کە گریمانەیەکی مەحاڵیشە ـ سـەرەنجام لەنێو ئاگری بلێسەداری دۆزەخدا دەسوتان، کەچی هێشتا ئەوان هەر لە خەمی ئەنجامدانی کارمەندییەکەیاندا دەبن و، تۆسقاڵێك سارد نابنەوە.

پێغەمبەران مرۆڤانێکن لە لوتکەی قوربانیداندان بە دەسکەوتە ماددی و مەعنەوییەکانیان. نە حەز و ئارەزووی بەهەشت و نیعمەتـەکانی، نـە ترسـی

---

١- ابن هشام، السيرة النبوية ١٠١/٢ ـ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٤٥/١.

٢ - هەروەها بڕواننە: سورة التوبة: ٧٢، سورة هود: ٢٩، سورة سبأ:٤٧

ئاگری دۆزەخ و ئازارەکانی، نەبوونەتە پاڵنەر بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە قورس و گرانە. تاکە ئـاوات و ئامانجیشـیان بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی خـوای گەورەیە.

بـەڵێ، سـەرجەم پێغەمبـەران "حەسـبی"ن. واتـە، خۆیـان یـەکلایی کردووەتەوە بۆ خوا و هەموو خواستێکیان ڕازی کردنی ئەوە. ئەم ئاکارەش لە پێغەمبەری خۆماندا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) لە چڵەپۆپەدایە. ئەوەتا هەر لە دنیـادا فەرموویەتی: " أُمتي" و، لە ڕۆژی قیامەت و مەحشەریشـدا هـەر دەڵـێ: " أُمتي.. أُمتي." [1]

ئەمە چۆن حەسبی بوونێکە! ئەوەتا بەهەشت دەرگاکانی دەخاتە سەرپشت و چاوەڕێی تەشریف هێنانی دەکات، کەچی ئەو لە پێناو ئەوەی ئوممەتەکەشی بەرێتە بەهەشتەوە، ناخۆشترین ساتەکانی مەحشەر بەسەر بەهەشتدا پەسـەند دەکات! دووبارە ئەمە چ حەسبی بوونێکە، کە تەنها بە تەنگ خزم و کەس و کـاری خۆیـەوە نییـە، بـەڵکو پەرۆشـی تێکـڕای ئوممەتەکەیـەتی، بـە گوناهبارەکانیشەوە...!

بەڵێ، دەلاقەی ڕۆحی پێغەمبەران تەنها بەسـەر یـەك خاڵـدا دەڕوانێـت: ڕەزامەندی خوای گەورە. لە غەیری ئەویش دەرگایان بە ڕووی هەموو شتێکی تردا قفڵ کردووە.

هەر بۆیە ئەو کەسانەی لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا شـانیان داوەتـە بـەر بەرپرسیارێتی ئیرشـاد و تـەبلیغ و، بوونەتـە میراتگـری دەعـوای نبـووەت، پێویستە زۆر وریا بن و بە هەستیارییەوە مامەڵە بکەن. چونکە کاریگـەریی قسە، لە بەلاغـەت و پیتـۆڵ زانیـدا نییـە، بـەڵکو لـە ئیخلاس و نییـەت

---

١- البخاری، تفسير (سورة البقرة) ١، التوحيد ٣٦ ـ مسلم، الإيمان ٣٢٢، ٣٢٦، ٣٢٧.

سافیدایه. هەڵبەت ئەمەش داخوازی حەسبی بوونە.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەم واتایە دەکات و، دەفەرمویّ: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ (یس: ٢١) "شوێنی ئەو کەسانە بکەون کە پاداشت و کرێتان لیّ داوا ناکەن، ئەوانە هیدایەت دراون و لەسەر بەرنامەیەکی ڕاست و دروستن." بەڵێ، شوێن پێغەمبەران بکەون کە لە ئاسمانی هیدایەت و ئیخلاسدا بەرزە فڕن و، داوای هیچ شتێکی دنیاییتان لیّ ناکەن.

ئەو کەسانەی دەیانکەنە ڕابەر و شوێنیان دەکەون، پێویستە زۆر بە چاکی هەڵیان بسەنگێنن و لە کێشانەیان بدەن. شوێن پێی کەسانێك هەڵبگرن، کە شەو و ڕۆژیان تەرخانییە بە عەشقی خزمەت. بەڵێ، ئەو پێشەوایەی بەدوایدا دەڕۆن، دەبێت ماندوێتی و زەحمەتی ئامادەکردنی ئەو شەقامانەی کە نەوەی سەربەرزی داهاتووی پێدا گوزەر دەکات، پەسەند بکات بەسەر گەیشتن بەو ڕۆژە زرق و بریقانەی کە بەری ماندوێتی تێدا دەخورێت. دەسا ئێوەش بەدوای کەسێکی وەهادا بگەڕێن و بیکەنە ڕابەر و پێشەنگی خۆتان.

ئیدی بەم جۆرە، ڕێگە نادات تەنانەت تارمایی بچووکترین سێبەریش بکەوێتە سەر دنیای ناخی، کە لە حەسبی بوون چنراوە.

پێغەمبەری پێشەوامان حەسبی بوو. بە درێژایی ژیانی تەنانەت لە نانی جۆش سکی تێر نەبووە.[1] جاری وا دەبوو چەندین ڕۆژ و هەفتە، بگرە مانگیش تێپەڕدەبوو و، لە ماڵە پڕ بەختەوەرییەکەیدا بۆ لێنانی چێشتێك یان شۆربایەك ئاگر نەدەکرایەوە.[2]

---

١ - البخاري، فرض الخمس ٣، الرقاق ١٦ ـ مسلم، الزهد ٢٧.
٢- البخاري، الهبة ١، الرقاق ١٧ ـ مسلم، الزهد ٢٦، ٢٨.

ئەبوو هورەیرە(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەگێڕێتەوە: " چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا دەبینم بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینم بە دانیشتنەوە نوێژ دەکەی، تووشی چی بووی؟ فەرمووی: 'برسێتیی' منیش دەستم کردە گریان، لە دڵی خۆمدا وتم: وا بوونەوەران لەبەر حورمەتی ئەو ئافرێنراون، خۆشەویستترین بەندەی خوایە، کەچی لەبەر برسێتی هێزی ئەوەی نییە بە پێوە راوەستێت و بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات. کاتێك بینی من دەگریم، دڵنەوایی کردم و، فەرمووی: 'ئەبوو هورەیرە مەگری، چونکە هەرکەس لە دنیادا برسێتی بچێژێت و دان بەخۆیدا بگرێ، دووچاری سەختیی لێپرسینەوەی رۆژی قیامەت نابێ'." [1]

جارێکیان ژنێکی ئەنساری شتێکی وەك دۆشەکی بۆ پێغەمبەری خوا هێنا و، دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)ش بەسەر ئەو حەسیرەدا دایخست کە پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام لەسەری پشووی دەدا. کاتێك گەڕایەوە و ئەم دیمەنەی دی، پرسیاری لە حەزرەتی عائیشە کرد. لەبەرامبەر ئەو وەڵامەی کە وەریگرت، فەرمووی: " عائیشە، هەر ئێستا بیبەرەوە بۆ شوێنی خۆی. سوێند بە خوا ئەگەر بمویستایە، خوای گەورە لە لای ڕاست و چەپمەوە، شاخی ئاڵتوون و زیوی لەگەڵدا دەخستمە رێ." [2]

بەڵێ، ئەگەر پێغەمبەری خوا بیویستایە، ئەوا لە خۆشگوزەرانیدا دەژیا، بەڵام نەیدەویست. رۆژێکیان فریشتەیەك هاتە خزمەتی و سەلامی لە خوای گەورەوە بۆ هێنا و، پرسی: " یا رسول الله، پەروەردگار سەلامت لێدەکات و،

---

١- أبو نعيم، حلية الأولياء ٧/١٠٩، ٨/٤٢-٤٣.

٢- إبن أبي عاصم، كتاب الزهد ١٤ ـ الطبراني، المعجم الأوساط ٦/١٤١ ـ البيهقي، شعب الأيمان ٢/١٧٣.

دەپرسێت: دەتەوێت پێغەمبەرێکی پاشا بیت، یاخود پێغەمبەرێکی بەندە؟ "

حەزرەتی جوبرەئیل یەکسەر هات بە هاناوە: تَوَاضَعْ يَا رَسُولَ اللهِ. " ئەی پێغەمبەری خوا ( لە بەرامبەر پەروەردگارتەوە) خاکیتی بنوێنە." پێغەمبەریش(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەڵبژاردنی خۆی دەکات و، دەفەرموێ: " دەمەوێت ببمە پێغەمبەرێکی بەندە (کە ڕۆژێك برسی بێت و ئارامیی لەسەر بگرێت، ڕۆژێکی تریش تێربێ و شوکری لەسەر بکات." [1]

ئەوەتا لەگەڵ خزمەتکار و هەژاراندا دادەنیشت و نانی دەخوارد. جارێکیان ئافرەتێك ئەم دیمەنە دەبینێت و دەڵێت: " تەماشاکە، وەك کۆیلە دانیشتووە و نان دەخوا! " فەخری کائیناتیش وەڵامی دەداتەوە و، دەفەرموێ: " جا کوا کۆیلەی لە من باشتر! من کۆیلە و بەندەی پەروەردگارم." [2]

سیرەی بۆنخۆشی گیانی دڵان(ﷺ)، پڕاوپڕە لە تابلۆی حەسبی بوون. درێژەی ئەو نموونانەش دەسپێرینە ئەو هەزارەها پەرتووك و سەرچاوانەی کە تایبەتن بە سیرەی حەزرەتی موستەفاوە. بەڵێ، هەموو پێغەمبەران لە پێش هەمووشیانەوە حەزرەتی موحەممەد(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، خۆیان یەکلایی کردووەتەوە و ژیانیان تەرخان کردووە بۆ خوا. لە بەرامبەر ئەو خزمەتەشیاندا کە ئەنجامیان داوە، داوای هیچ پاداشتێکی دنیایی یان قیامەتییان نەکردووە. نهێنی کاریگەر بوونی قسەکانیشیان ئا لێرەدایە. جا بۆیە ئەوانەی دەخوازن گوفتارەکانیان وەك ئاوی ژیان کاریگەر بێ و، لە ناخی بەرامبەردا شوێنەوار بەجێ بهێڵێت، دەبێ سەرەتا فێری ئەوە بێ کە لەبەرامبەر ئەو خزمەتانەی

---

١- إبن المبارك، الزهد ٢٦٤-٢٦٥ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢٣١/٢ ـ النسائي، السنن الكبرى ١٧١/٤ ـ الطبراني، المعجم الكبير ٢٨٨/١٠، ٣٤٨/١٢ ـ البيهقي، السنن الكبرى ٤٨/٧-٤٩ ـ شعب الأيمان، ١٧٧/١، ١٦٧/٢، ١٠٧/٥ ـ الهيثمي، مجمع الزوائد ١٩/٩-٢٠.

٢- الطبراني، المعجم الكبير ٢٠٠/٨.

دەیکەن، هیچ شتێك، لە هیچ کەسێك داوا نەکەن...

## ٣ـ ئیخلاس

ئیخلاس واتە هەرکارێك کە دەیکەیت یان وازی لێ دێنی، لە پێناو خوادا بێت. پێغەمبەران کەسانێکن هەر لەسەرەتای کارەکەیانەوە گەیەنراونەتە لوتکەی ئاوەها ئیخلاسێك. دەگونجێ مرۆڤەکان بە هەوڵ و کۆششی خۆیان بگەنە پلەیەکی دیاریکراوی مەقامی ئیخلاس، ئەوەندە هەیە کۆتا خاڵ کە پێی دەگەن، جگە لە خاڵی دەسپێك بۆ پێغەمبەران چی تر نییە. هەروەك بلێی ئەوان کراونەتە کاکڵەی ئیخلاس و بە پایەی "مُخلَصین" خەڵات کراون. قورئانی پیرۆز ئەم تایبەتمەندییەی پێغەمبەران، لە هەندێکیاندا بەرجەستە دەکات و بەم شێوەیە باسیان دەکات: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾ (مریم: ٥١) " یادی موساش باس بکە لە قورئاندا، بەڕاستی ئەویش کەسێکی هەڵبژاردە و دڵسۆز و پێغەمبەر فرستادە بوو."

لەبارەی حەزرەتی یوسف(عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ)یشەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ (یوسف: ٢٤) " بەڕاستی یوسف لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە."

هەروەها لە کەسایەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ڕووی گوفتار دەکاتە ئوممەتەکەی و، دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ (الزمر: ٢) " بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم) تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە، کەواتە هەر خوا بپەرستە و هەر ملکەچ و دڵسۆزبە بۆ ئاین و بەرنامەکەی."

دیسان خوای گەورە(عَزَّوَجَلَّ) خۆشەویستەکەی دەدوێنێت و، دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي﴾ (الزمر: ١٤) " بڵێ: من تەنها هەر خوا دەپەرستم و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو دەبم."

هۆکاری عیبادەت، ئەمری خوای گەورەیە. ئەنجامەکەشی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوە، بەروبوومەکەشی ئەو شتانەیە کە لە ئاخیرەتدا لوتفیان دەکات. ئەم پەرستشە هەموو ژیان دەگرێتەوە و کاریگەری و شوێنەواریشی لە هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکی ئیمانداردا لە شێوەی شعور و إذعاندا ڕەنگ دەداتەوە. کاتێکیش بیرمەندی گەورەی سەردەم"بەدیعوززەمان" دەڵێت: " لە پێناو خوادا کاربکەن، لەبەر خوا دەست پێبکەن، لە بۆ خوا هەوڵ بدەن و، لە بازنەی ڕەزامەندی ئەودا بجووڵێنەوە." [1] ئەوا پێناسەی ئیخلاس دەکات و، جەختیش لەسەر پێویستییەکەی دەکاتەوە.

ئیخلاس ناونیشانی مرۆڤی ڕاستەوە. لە ژیانی مرۆڤی موخلیصدا ئەملاو ئەولا کردن بوونی نییە. چونکە گەشتی ڕۆحانی (السير الروحاني)ی ئەو، هەردەم لە گەشە و بەرزبوونەوەدایە بەرەو بڵندی. ئیتر بۆیە تەوازوع و سادەیی یەکەم ڕۆژی چۆن بووە، کاتێك گەیشتووەتە لوتکەش هەروا ماوەتەوە و پاراستوویەتی. بەڵام چەندە کەمن ئەو جۆرە مرۆڤانە!.

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تەنیا یەك کەس هەیە گەیشتبێتە لوتکەی ئەم ئاسۆیە، ئەویش رسول الله یە. ئەوەتا هێندەی گەردیلەیەك جیاوازی نییە لەنێوان ئیخلاس و تەوازوعی یەکەم ڕۆژی بانگەوازەکەی، لەگەڵ ئیخلاس و تەوازوعی ئەو ڕۆژەی فەتحی مەککەی کرد.

مەککە بە ڕێککەوتن فەتح کرا ـ بەدەر لە چەند ڕوداوێکی تاك و تەرا کە

---

١- بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، وتەکان، وتەی یەکەم. وەرگێڕانی فارووق ڕەسووڵ یەحیا.

دروست نییە گشتگیر بکرێت ـ کاتێك فەخری کائینات(ﷺ) چووە ناو ئەو شارە پیرۆزەی کە پێش چەند ساڵێك لێی دەرکرابوو، بە شێوەی سەرکردەیەکی فاتیحی سەرکەوتوو نەچووە ناوشارەکە، بەڵکو بەسەر ئێسترەکەیەوە سەری ئەوەندە دانەواندبوو، وەخت بوو بدات لە پشتی ئێسترەکەی .[1]

لە مەدینەشدا هەرگیز ڕەفتاری نەگۆڕا. ئەوەتا کە ئەڕۆیشت بۆ لای هاوەڵەکانی، ئەوانیش لەبەری هەڵدەستان ـ دەشبوو هەڵسانایە ـ تەنانەت کە ئەو تەشریفی دەهێنا دەبوو مردووی گۆڕستانەکانیش لە گۆڕەکانیان ڕاپەڕینایە و ڕێزی خۆیان بنواندایە- بەڵێ، ئەو شایانی زۆر لەمانە زیاتریش بوو. کەچی بە لەبەر هەستانەوەی ئەصحاب زۆر ناڕەحەت دەبوو و هەموو جارێك دەیفەرموو: لاَ تَقُومُوا كَمَا تَقُومُ الْأَعَاجِمُ.[2] " لەبەرم هەڵمەسن، وەك چۆن عەجەمەکان لەبەر گەورەکانیان هەڵدەسنەوە."

بەڵێ، چۆن دەستی کردبوو بە ئەرکە پیرۆزەکەی، ئاوەهاش کۆتایی پێ هێنا. ژیانی لەسەر هەمان ئاواز و لە نێو هەماهەنگیدا دەگوزەراند. بە چ پەردەیەکی دەنگی دەستی پێ کردبوو، هەر بەو پەردەیەش گەیاندییە پایان. تەنانەت لە ڕوویەکەوە دەتوانین بڵێین: پێغەمبەری خوا لە سەرەتادا بە نەوایەکی کز دەستی بە چرینی ئەم بەستە ئیلاهییە کرد و، لە کۆتاییشدا چریکەی گەیشتە ئاستێك، ئاسمان و زەمینی دەهێنایە لەرزە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەرکەوتنێکی بێ وێنە بوو. بەڕاستی هەموو ژیانی لێبڕان بوو لە پێناو پەرستشێکی خالیصانەی پەروەردگاریدا و دەروونی لە مەعریفەتی ئیلاهی سەررێژ بووبوو. ڕوانینەکانی بەردەوام بەدووی شوێنەواری مەزنیی

---

١ - إبن هشام، السيرة النبوية ٦٣/٥ ـ أبو يعلى، المسند ١٢٠/٦.

٢ - أبو داود، الأدب ١٥٢ ـ إبن ماجه، الدعاء ٢ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢٥٣/٥.

ئەودا بوون و سەرجەم هەستەکانیشی بەو چێژە مەعنەوییانەی لەوەوە دەهاتن، کەوتبوونە جۆش و خرۆش. چارۆکەکانی بەڕووی حەقیقەتدا هەڵکردبوون و، بە ئیشتیهایەك کە تێربوونی نەدەزانی، لە پەرستشی مەعبوودەکەیدا بوو، ئاخر ئەو مەردی مەیدانی ئیخلاس بوو...

شعووری "ئیحسان"یش لەودا ، ڕەهەندێکی تری دەهاویشتە سەر ئەمە. چونکە ئەوەتا لە چوارچێوەی پێناسەکەی خۆیدا، ئیحسان بریتی بوو لەوەی خوا بپەرستی هەروەك ئەوەی دەیبینی.[1] جا ئەگەر ئەمە بە نموونەیەك ڕوونبکەینەوە، دەڵێین: لە کاتێکدا کەسانی تر بۆ نوێژکردن ڕوویان لە قیبلە دەکرد ، ئەو نوێژەکەی لەناو خودی کەعبەدا دەکرد.

## ٤ـ ئامۆژگاریی چاك (المَوعِظَةَ الحَسَنَة)

هەرگیز پێغەمبەران لەکاتی بەجێهێنانی کاری تەبلیغ و بانگەوازدا، خۆیان دووچاری مەرایی ناکەن. بەڵکو بە"حیکمەت" و "ئامۆژگاری چاك" لە خەڵکی نزیك دەبنەوە. قورئانی پیرۆز ڕوو لە پێغەمبەری خوا دەکات و، دەفەرموێ:

﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ (النحل: ١٢٥)

" (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و

---

١ - البخاري، الایمان ٣٧ ـ مسلم، الایمان ٥،٧.

بەجێ. هەروەها بە جوانترین و چاکترین شێوە گفتوگۆ و موجادەلـەیـان لەگەڵـدا بکە."

حیکمەتی شتان و نهێنییەکانی بەدیهێنانیان بە شێوازێکی نەرم و دڵنیایی بەخش بۆ ڕوونبکەرەوە. واتە، بەبێ ئەوەی هەستیان بریندار بکەیت، هـەردەم لە هەوڵی تێرکردنی دڵ و عەقڵیاندا بە!

پێغەمبەران ڕێگەی دەمەدەمێ و مشتومڕ ناگرنەبەر و، هیچ بایەخێکیش بە شێوازی فەلسەفی نادەن. چونکە نە لە ڕابردوو و، نـە لـە ئێستاشـدا، بـە پەیڕەوکردنی ئەم ڕێگایە نەتوانراوە ـ بەدەر لە چەند کاڵفامێك کـە پیشـەیان ئەوەیە ـ هیچ شتێك بە هیچ کەسێك بگەیـەنرێت. خـوای گـەورەش ویسـتی لەسەر نەبووە سـەرقاڵیان بکـات بـە کـارێکی وا بـێ هـودەوە. هـەر بۆیـە ئەرکەکەیان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بە "حیکمەت" و "ئامۆژگاری چاك" بانگەواز بکەن.

مرۆڤ تەنها "عەقڵ" و "زیهن" نییە، بەڵکو "دڵ" و، "ڕوح"و، "سر"و، "خەفی"و "أخفی"شـی هەیـە، و هـەر یـەکێکیش لەمانـە پێویسـتی بـە تێرکردنە. ئیدی پێغەمبەران بە ڕەچاوکردنی کۆی ئەم لایەنانە، پەیامەکانیان دەگەیەنن و دڵنیایی و قەناعەت دەبەخشنە سـەرجەم هەسـت و نەسـتەکانی مرۆڤ. جا سەرەنجامی وەها تـەبلیغێك، کـە هـیچ لایـەن و تایبەتمەندییـەکی مرۆڤـی تێـدا فـەرامۆش ناکرێـت، توانـەوەی شەختەسـەهۆڵی گومانـەکانی بەرامبەر و، گەیشتنە بە پلەی یەکبوون (وحدة) لە ئیماندا، کە ئەمەش چەقی بوونی مرۆڤە.

ئەوانەی لە بازنەی دەرسی پێغەمبەراندا پێدەگەن، دەبنە خاوەن یەقینێکی تەواو جیاواز. لەپاڵ ئەو چاوانەیاندا کە تەماشـای ئـەم جیهانـەی پێدەکـەن، پێڵووی چاوەکانی دڵیشیان دەکرێتەوە و، شتانێك کە بە لای کەسـانی تـرەوە

نەزانراون، بۆ ئەمان ئاشکرا دەبن. ئەگەر سەرانسەری دنیاش پڕ بێت لە گومان و ختورە، لەوانەیە ئەمان تەنها بە بزەیەکی گاڵتەئامێزەوە بەلایدا گوزەر بکەن. بەڵێ، هیچ مێش و مەگەزێکی گومان ناتوانێت بەسەر شانەی مەعریفەتی ئەوانەوە بنیشێتەوە. پەروەردگاری خاوەن توانست و زانستی ڕەهاش هەر مەعریفەتێکیان دەکات بە هەزار و، بەرەکەت دەخاتە زانیارییەکانیانەوە و، ئەو شتانەشیان فێردەکات کە پێشتر نەیانزانیوە.[1]

سروەی ئەو ئیلهامانەی لە ئاسمانەوە شنەیان دێ، وەك بلێی دڵی ئەوان دەکاتە ئاسمان و، کاتێکیش کار بەوە دەکەن کە دەیزانن، خۆیان لەسەر پشتی " الکلمة الطیبة " وە دەبیننەوە و بەرەو ئاسۆ بەرزەکانی ئاسمان بەرز دەبنەوە.[2]

تەنانەت لەنێویاندا کەسانێکی وەك ئیمامی عەلی(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) هەڵدەکەوێت، کە فەرموویەتی: " ئەگەر پەردەش لابدرێت، من یەقینم هیچ زیاد ناکات." [3] واتە ئەگەر پەردەی غەیبیش لابدرێت و هەموو ئەو شتانە ببینم کە لە دوا قۆناغدا دەیبینم، وانازانم بگەمە ئاسۆیەکی مەعریفی بالاتر لەوەی کە ئێستا ئیمانم پێیەتی. چونکە دڵنیام کە لە ترۆپکی ئیمان بە غەیبدام.

---

١- ئاماژە بە فەرموودەیەکی لەم جۆرە دەکرێ: (من عمل بما علم ورثه الله علم مالم یعلم) أبی نعیم، حلیة الأولیاء ١٠/١٥ واتە: " هەرکەس کار بکات بەوەی کە دەیزانێت، خودا زانستی ئەوەیشی پێ دەبەخشێ کە نایزانێ."

٢- ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾ (فاطر: ١٠) واتە: "گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە (خوای گەورە) سەردەکەوێ، کار و کردەوەی چاکیش بەرزی دەکاتەوە. "

٣- أبو نعیم، حلیة الأولیاء ١٠/٢٠٣ ـ علي القاري، الأسرار المرفوعة ١٩٣.

ئەم قسەیە لە لای کەسێکی وەك حەزرەتی عەلی، قسەیەکە لە مـەقامی باسکردنی نیعمەت (تحدیث النعمة)دا وتراوە. ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕایگەیاندووە کە بە تەقدیری خوای گەورە، حـەزرەتی عـەلی دەبێتـە بـاوکی هەموو ئەو ئەولیایانەی کە تا ڕۆژی قیامەت دێن. چـونکە لەپـەنای خۆیـدا پەروەردەی کرد و باشترین و جوانترین و شۆخترین ئافرەت و گـوڵی باخچـەی پێغەمبەرایەتی، حەزرەتی فاتیمەی دایکمانی لێ مارەکرد، کە لە حۆریەکانی بەهەشت جوانتربـوو. لـەو هاوسـەرگیرییە پیرۆزەشـەوە هـەردوو ڕێحانەکـەی بەهەشت حەزرەتی "حەسەن و حوسێن" هاتنە دنیاوە و، سەرجەم قـوطـب و ئەولیاکانیش هەر لەم وەچەیەوە هاتوون.

جا هەروەك ئەوەی حەزرەتی عەلی بەم شێوەیە بوو، نزیکەی دانـەی ئەڵقەکانی ئەو زنجیرە زێڕینەش کە لەوەوە بەردەوام بوو، هەریەکەیان بۆ خـۆی پاڵەوانێك بوو لە نوێنەرایەتی کردن و پەیکەڵ کردنی ئەم شعورەدا.

بەڵێ، ئەم شعورە لەو کەسانەدا شکۆفە دەکات کە لە دەرەنجامی ئیمان و ئیسلامەوە گەیشتوونەتە ڕازی ئیحسان.. ئەوانە هەر لە دنیادا مەزهەری گوفتاری ئەم ئایەتە دەبن:﴿فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ (ق:٢٢) " ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوە و هەموو شتێک وەکو خۆی دەبینیت و ئەمرۆ چاوەکانت تیژە..."

جا هەرکات ئەو حاڵەتەی کە خۆرئاواییەکان ناوی "Intuition"یان لێناوە، لە ویژدانی مرۆڤدا کارا بوو، ئیتر جیهانی دەرەوە بێ دەنگ دەبێ و زایەڵـەی هەستەکانی ناوەوە سەرتاپا کیانی مرۆڤ دەتەنن و ڕۆح دەبووژێتـەوە. چـونکە ئەو کات سوڵتانی مەعریفەت لەسەر تەختی دەروون گیرساوەتەوە. ئیتر دوای ئەمە چ پێویست دەکات لەدەرەوە بۆی بگەڕێت..؟

بەڵێ، ئەو پێغەمبەرە ئازیزەی کە قوتابی و شاگردەکانی بۆ ئەم ئاستە بەرز کردەوە، هەمیشە و هەردەم " ئامۆژگاری چاك"ی ـ بە فراوانترین واتاکانیەوە ـ کردبووە بنەما و، تەلاری ئیرشادیشی لەسەر ئەم بناغەیە بونیات نابوو.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە کورترین و ڕەوانترین شێوە ئەو لایەنانە دەردەبڕێت کە ئێمە دەمانەوێت لێرەدا باسیان بکەین: ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ١٥١) " هەر وەکو (بۆ تەواو کردنی نازو نیعمەتم) لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لە خۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی."

لام وایە لێرەدا پێویست بە درێژەی زیاتر نەکات، چونکە چەند نموونەیەکمان هێنایەوە لەبارەی مەودای بایەخی پێغەمبەری ئازیزمان و هەستیاریی لەم لایەنەوە. بەڵام ئەگەر بمانەوێ بابەتەکە لە دوو سێ ڕستەدا کورت بکەینەوە، ئەوا دەڵێین: بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) هەموو کەسێکی بە گوێرەی حاڵ و ئاستی و بە لەبەرچاو گرتنی عەقڵ و دڵ و ویژدانی، بێ زیاد و کەم دەدواند. هەموو ئەمانەشی بە شێوازێکی دانایانەی ئەوتۆ پەیڕەو دەکرد، کە ئەگەر ئەو کەسە کۆڕەکەی بەجێ بهێشتایە، بە دڵێکی ئاسوودەوە دەڕۆیشت و ئیمانی دەهێنا. تەنانەت کەسانێکی هاوشێوەی وەلیدی کوڕی موغەیرە و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، وێڕای داننانیان بەوەی قسەکانی پێغەمبەری خوا حەقە، کەچی غروور و خۆبەزل زانیان بوونە ڕێگر و، مەحکومی زیندانی بێ ئیمانیی کردن. هەندێکیشیان بوونە قوربانیی دەستی

ترس و، له ئینکاریـدا مانـەوە. لـە ڕاسـتیدا، هۆکـاری هـەموو ئەمانـەش دەگەڕێتەوە بۆ کەموکورتی و ناتەواویی ئەوانەی لـە دۆخـی وەرگـردا بـوون. جاری واش دەبوو کەسانێکی وەك "ئەعشای شاعیر" سـەرەڕای قبـوولکردنی هەموو شتێك، کەچی نەیاندەتوانی دەسبەرداری نەریتـە خووپێگرتووەکانیـان ببن و لێی دوور بکەونەوە، بۆیە داوای مۆڵەتیان دەکرد. جا ئەگەر ئەم کەسانە بەر لەوەی هیدایەتیان وەرگرتبێت، مردبێتن، ئەوا ئەو کات دەبێت لە ڕوانگەی سەبقەتی قەزا و قـەدەرەوە بـۆ ئـەم مەسـەلەیە بڕوانین. لـە کـۆی هـەموو ئەمانەشدا کەموکورتییەك نییە ـ حاشاـ بگـەڕێتەوە بۆ پێغەمبـەری خوا و ناشبێت.

## ٥ ـ بانگەواز بۆ تەوحید

سـەرجەم پێغەمبـەران هەڵسـاون بـە بـانگ کردنـی گەلـەکانیان بـۆ یەکتاپەرستیی خوای تـاك و تـەنیا. ئـەوەتا قورئـانی پـیرۆز کاتێـك باسـی بانگـەوازی پێغەمبـەران دەکـات، جـەخت لەسـەر ئـەم خاڵـە دەکاتـەوە و، دەفەرموێ: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ (هـود: ٨٤) " ئـەی قەومەکەم بەندایەتی خوا بکەن، هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو."[١]

بەڵێ، بانگەوازی هـەموو پێغەمبـەرێك بـەم حەقیقەتـە مەزنـە دەسـت پێدەکات و هەر بەمەش کۆتایی دێت.

کۆدەنگیی ئەم کەسایەتییە ناوازانە ـ کە لە کات و شوێنی جیاواز لە یەکتردا هاتوون ـ لەسەر هەمان خاڵ و، بانگەواز کردنیان بۆ هەمان

١ـ سورة ألأعراف: ٥٩، ٦٥، ٧٣، ٨٥ ـ سورة هود: ٥٠، ٦١، ٨٤ ـ سورة المؤمنون: ٢٣، ٣٢

حەقیقەت، هیچ بوارێك بۆ گومان و دوودڵی ناهێڵێتەوە كە ئەوانە بانگەشە بۆ فكرێك یان هزرێكی تایبەت بە خۆیان ناكەن، بەڵكو بانگخواز و گەیەنەری ئەو پەیامانەن كە لە لایەن پەروەردگاریانەوە پێیان گەیشتووە. چونكە ناچێتە عەقڵەوە كەسانێك توانا و لێهاتنی جیاوازیان هەبێت و لە سەردەمی جیاواز و جێگەی جیاوازدا ژیابن، كەچی ئا بەم چەشنە لە بابەتێكدا كۆك و یەكڕا بن! خۆ ئەگەر تەماشای هەر قوتابخانەیەكی فەلسەفی یاخود ڕێچكەیەكی فكری بكەین، دەبینین تەنانەت لە مەسەلە زۆر بچووك و لاوەكییەكانیشدا، ناكۆكی زۆر لە نێوان لایەنگرانی هەمان ڕێبازدا بوونی هەیە، ئەگەر چی لە هەمان سەردەمیشدا بن.

بوونی جیاوازیی لە بزافە فكرییەكانی مرۆڤدا و، یەكدەنگیش لەو كۆڕێسا ئیلاهییەی كە پێغەمبەران هێناویانە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە یەكەمیان لە هەوەس و ئارەزووی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە و، دووهەمیشیان هەڵقوڵاوی كانگای وەحی و هیدایەتە.

بەڵێ، كۆدەنگیی پێغەمبەران(عليهم السلام) لەسەر حەقیقەتی تەوحید، یەكێكە لە تایبەتمەندییەكانی مەقامی پێغەمبەرایەتی. هەربۆیە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ: " أَفْضَلُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ. " باشترین شتێك كە من و پێغەمبەرانی پێش منیش وتومانە بریتییە لە: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ." [1]

---

١- الموطأ، القرآن ٣٢، الحج ٢٤٦ ـ عبدالرزاق، المصنف ٣٧٨/٤. بۆ چەند دەربڕینێكی تری نزیك لەمانەوە، بڕواننە: الترمذي، الدعوات ١٢٢.

## ج ـ ئاكاری پێغەمبەران

### ١ ـ ڕاستگۆیی (الصدق)

ڕاستگۆیی تەوەرەی پێغەمبەرایەتییە. بەڵێ، نبووەت بە دەوری خولگەی ڕاستگۆییدا دەسووڕێتەوە و هەر شتێك لە زاری پێغەمبەرانەوە دەرچێت، مۆری تەصدیقی پێوەیە. چونکە ئەوان هەرگیز شتێك نالێن پێچەوانەی ڕاستی بێت. قورئانی پیرۆزیش کاتێك ڕاڤەی ئاکار و پایەبەرزیی هەندێك لە پێغەمبەران دەکات، ئەم سیفەتەیان دەخاتە پێش چاو و، دەفەرموویٚ:﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴾ (مریم: ٤١)

" هەروەها لە قورئاندا باسی (گۆشەیەک لە بەسەرهاتی) ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، بەڕاستی ئەو کەسایەتییەکی ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانیش بوو."

واتە، لە "لەوحی مەحفووز" یان لە قورئاندا - کە حەقیقەتێکی جێگیر و نوسخەی لەوحی مەحفووزە- یادی ئیبراهیم بکە. ئەو پێغەمبەرێك بوو لە کردار و گوفتاریدا لەوپەڕی ڕاستگۆییدا بوو.

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيًّا ﴾(مریم: ٥٤)

" موساش باس بکە لە قورئاندا، بە ڕاستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا ڕاستگۆ بوو، ئەو پێغەمبەر و ڕەوانە کراوی خوا بوو ."

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ۝ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾ (مریم: ٥٦-٥٧) " هەروەها لە قورئاندا باسی ئیدریس بکە، چونکە ئەویش

پێغەمبەرێکی زۆر ڕاستکار و ڕاستگۆ بوو.. بۆیە ڕێزی زۆرمان لێگرت و پایەدار و بەرز و بڵندمان کرد."

ئەو دەمەش کە قورئانی پیرۆز وتووێژی هاوەڵی زیندانییەکەی حەزرەتی یوسف(ﷺ)مان بۆ دەگێڕێتەوە، هەڵوێستە لەسەر هەمان پەسن دەکات و دەفەرموێت: ﴿ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ﴾ (یوسف: ٤٦) " یوسف ئەی هاوەڵی ڕاستگۆم! "

ئاخر چۆن دەکرێت پێغەمبەران ڕاستگۆیی لە خۆیاندا بەرجەستە نەکەن، لە کاتێکدا خوای تەعالا فەرمانی ڕاستگۆیی بە کەسانی ئاسایی دەدات و، بە ستایشەوە گرۆی ڕاستبێژان ناودەبات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (التوبە: ١١٩) " ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکار بن، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن ."

هەروەها ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تەنیا ئیمانداره خەباتکارەکان لە پێناوی خوادا ڕاستگۆن:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ (الحجرات: ١٥) " بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەری خوا هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بە خۆیان و سەر و ماڵیشیانەوە تێکۆشاون لەپێناوی ئاینی خوادا، تەنها ئا ئەوانە ڕاستن."

## أ ـ ڕاستگۆیان شایانی ستایشن

قورئانی پیرۆز ستایشی ئەو ڕاستگۆیانە دەکات کە ڕاستیان کرد لەگەڵ ئەو پەیمانەی بە خوایان دابوو: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا﴾ (الأحزاب: ٢٣) " مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا، ڕاستیان کرد لەسەری ژیان و پابەند بوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کرد و مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەک گۆڕان و لاری ڕووی تێ نەکردوون.."

لێرەدا دەمەوێت هەڵوێستەیەك لەسەر ئەو ئایەتەی سەرەوە بکەم:

ئەنەسی کوڕی مالیك(رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خزمەتکاری پێغەمبەری خوا بوو. کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هێنا بۆ مەدینە، ئەوکات ئەنەس تەمەنی دە ساڵان بوو. دایکی دەستی گرت و بردی بۆ حزووری پێغەمبەری خوا و وتی: " ئەی پێغەمبەری خوا! با ئەنەسی کوڕم بە درێژایی تەمەنی لە خزمەتتاندا بێت." دایکی ئەمەی وت و، کوڕەکەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت.[1]

جا ئەم ئەنەسە دەڵێ: " ئەم ئایەتە: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ...﴾ لەبارەی "ئەنەسی کوڕی نەضر"ی مامم و هاوشێوەکانی ئەوەوە دابەزیوە." [2]

کاتێك ئەنەسی کوڕی نەضر(رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) لە پەیمانی عەقەبەدا پێغەمبەری خوای بینی، کەمەندکێش و شەیدای بوو. بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت، نەیتوانی لە جەنگی بەدردا بەشداری بکا. بێگومان بەدر پێگەیەکی تایبەتی

---

١ - أبو يعلى، المسند ٣٠٦/٦ ـ الطبراني، المعجم الصغير ١٠١/٢.

٢ - مسلم، الأمارة ١٤٨ ـ الترمذي، تفسير (سورة الأحزاب) ٢-٣.

و دیاری هەبوو. جا هەروەك چۆن بەشداربووانی بەدر لە نێو هاوەڵاندا دیار و ناسرابوون، ئاواش ئەو فریشتانەی لە بەدردا بەشدارییان کردبوو، لە نێو ئەهلی ئاسماندا ناسراو و بژاردە بوون. ئەمە وتەی حەزرەتی جوبرەئیلە کە خۆشی لە بەشداربووانی بەدرە و سەرکردایەتی سوپای فریشتەکانی کردووە.[1] بەڵام وەرە ببینە وا ئەنەسی کوڕی نەضر ئەم هەلەی لەدەست دەرچووە. ئیتر لە تاوا ئۆقرەی لێ بڕابوو و خەو نەدەچووە چاوانی. بۆیە هاتە حزووری فەخری کائینات و دەردە دڵی خۆی عەرز کرد: " یا رسول الله، ئەگەر جارێکی تر ڕووبەڕوو بوونەوەی بێباوەڕانمان بە نسیب بێ، مەگەر خوا خۆی بزانێت چییان بەسەردا دێنم." خوای ئاگادار بە پەنهانترین ڕازەکانی دڵی مرۆڤ، ئەم نیازە پاك و بێگەردەی ئەنەسی قبووڵ کرد و، ساڵی دواتر لە ئوحوددا ڕووبەڕووی بێ باوەڕان بووەوە.

ئوحود.. هەر کاتێك ناوی ئوحود دەبرێت، دەروونمان دەگوشرێت و دڵتەنگی ناخمان دەتەنێ. چونکە لەوێدا حەفتا صەحابی شەهید بوون. کێ دەزانێ، لەوانەیە لە ڕوانگەی دەربڕینی حەقیقەتێکەوە، هەروەها ڕێگریش لەوەی نەبادا بەهۆی ئەم یادەوەرییە تاڵەوە، شتێکی نەخوازراو بدەینە پاڵی، ڕۆژێکیان کە پێغەمبەری خوا بەلای ئوحوددا تێ دەپەڕی، ئەم وشانەی لە زار هاتنە دەر: أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ. " ئوحود چیایەکە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت."[2]

ئوحود چیایەکە هەڵگەڕان و سەرکەوتن بەسەریدا سەختە. بەڵام جەنگی ئوحود لەویش سەختتربوو. جا هەرچۆنێك بێت، بە شێوەیەکی کاتی هەندێك لە هاوەڵان نەیانتوانی وەك پێویست شوێنی ئێشکگریی خۆیان بپارێزن.

---

١ - البخاري، المغازي ١١ ـ إبن ماجة، المقدمة ١١.
٢ - البخاري، الزكاة ٥٤ ـ مسلم، الحج ٥٠٣-٥٠٤

تەنانەت سەنگەریشیان گۆڕی و چوونە دەرەوەی ئەو شوێنەی پێغەمبەری خوا بۆی دیاری کردبوون. بەڵام ئەمە تەنها ستراتیژ و سەنگەر گۆڕینێك بوو، بۆیە دروست نییە بەمە بوترێت"شکست". بەڵێ، ئەدەب و حورمەت زانینی ئێمە بەرامبەر بە ئەصحاب(ﷺ) لەم چوارچێوەدایە.

لەم جەنگەدا پێغەمبەر(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) برینداد بـوو و ددانــی مویــارەکی شکا. دوو ئەڵقە لە خوددەکـەی سەریشــی چـەقی بـە ڕوومــەتی پیرۆزیــدا و خوێناوییان کرد. کەچی سەرەڕای هــەموو ئەمانــە، پێغەمبــەری ڕەحمــەت و لێبوردەیی، دەستەکانی هەڵبڕی بۆ بارەگای خـوای باڵادەسـت و، فـەرمووی: اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ.[1] " خوایە لە گەلەکەم ببورە چونکە ئەوان نازانن." هەر لەو جەنگەدا ئەنەسی کوڕی نەضر ئەمسەر و ئەوسەر هەڵدەسوڕا و، لێرە و لەوێ هەوڵی دەدا پەیمانەکەی بهێنێتەجێ کە ساڵێك پێشتر دابووی بە پێغەمبەر(ﷺ). ئیتر وا ئـەویش وەك زۆرێکـی دی بـەرەو خـاڵی کۆتـایی هەنگاوی دەنا. جەستەی شەکەتی لەتاو پێکانی ڕم و گـورزی شمشـێردا کـون کــون ببــوو. کاتێــك لــە دوا ســاتەکانی ژیانیــدا بــوو، ســەعدی کــوڕی موعاذ(رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) هاتە لای و، ئەنەس بەدەم زەردەخەنەیەکەوە دوا قسەی خۆی بۆ کرد: " سڵاوم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا. وەڵڵاهی ئێســتا لــە دامێنــی ئوحودەوە هەست بە بۆنی بەهەشت دەکەم." [2]

لەو ڕۆژەدا ناسینەوەی زۆرێك لە شـەهیدەکانی وەك حـەزرەتی حـەمزە و موصعەب، کارێکی ئاسان نەبوو. عەبدوڵڵای کوڕی جەحش(رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) مەگەر پارچەکانی جەستەی بهێنرایەتەوە لای یەك، ئینجا دەتوانرا بناسرێتەوە و بڕیار

---

١ - البخاري، الانبياء ٥٤ ـ مسلم، الجهاد ١٠٥ ـ القرطبي، الجامع لأحكام القران ١٩٩/٤.

٢ - البخاري، المغازي ١٧ ـ مسلم، الأمارة ١٤٨.

بدرێت: " ئەمە خۆیەتی" ئەنەس بن نەضریش لەمان جیاوازتر نەبوو، تا خوشکەکەی نەهات نەناسرایەوە. خوشکەکەی سەیری ئەو دەستەی کرد کە شمشێری پێ هەڵگرتبوو ـ لەوانەیە تەنها شوێن بووبێت لێدانی بەرنەکەوتبێت ـ ئەوجا ناسییەوە و بە چاوی پڕ ئەسرینەوە وتی: " یا رسول الله، ئەمە خۆیەتی." [1]

ئیتر ئەم ئایەتە باسی ئەو ئازایەتی و جوامێرییە دەکات. ئەنەسی کوڕی نەضر بەڵێنەکەیی بردە سەر و، تا دوا هەناسە جەنگا و تەنانەت مردنیش بەدرۆی نەخستەوە.

بەڵێ، پێویستە هەموو کەسێك دوای وتنی" لا إله إلا الله" تا ئەو ڕادەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو وتە پیرۆزەدا ڕاستگۆبێت، تاوەکو شکۆمەندی دین و ئیمان پارێزراو بێت. هەر بۆیە کاتێك قورئانی پیرۆز ستایشی ئەو جۆرە شەهیدانە دەکات، لەو ڕوانگەیەوەیە کە ببنە نموونە و سەرمەشق بۆ ئیمانداران.

بەڕاستی ئەنەسی کوڕی نەضر و ئەنەسی کوڕی نەضرەکان ڕاستگۆبوون بەرامبەر بەڵێنەکانیان و، سەلماندیان کە مەردی مەیدانی ڕاستی و دروستین. ئاخر چۆن وا نەبن، لە کاتێکدا ئەم وانەیەیان لە فەخری عالەم، حەزرەتی موحەممەدی ئەمینەوە وەرگرتووە؟! جا هەروەك ئەو سەروەرە ڕاستگۆ و ئەمین بوو، ئەصحابەکانیشی ئاوا ڕاستگۆ و ئەمین بوون...

---

١ - البخاري، المغازي ١٧ ـ مسلم، الأمارة ١٤٨.

## ب ـ له سەردەمی نەفامیدا بە "ئەمین" ناسرابوو

خەڵکی مەککە هەرگیز بەناوی خۆیەوە بانگیان نەدەکرد، بەڵکو سیفەتی "ئەمین"یان دەدایە پاڵی و بە "موحەممەدی ئەمین" بانگیان دەکرد.. بەڵێ، بەو نازناوەوە ناوی دەرکردبوو. ئێمەش چەندە بەختەوەرین کاتێك بەیانیان و ئێواران بەم ویردەی کە خوێندنی "مُسْتَحْسَنْ"ە، یادی دەکەینەوە و، دەڵێین:

لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ الْمُبِينُ، مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّهِ صَادِقُ الْوَعْدِ الْأَمِينُ.

ماڵی خوا (کەعبە) بەهۆی لافاوەوە درزی بردبوو. خەڵکی مەککەش دەیانویست نۆژەنی بکەنەوە. لەو کاتەدا بەهۆی گێڕانەوەی بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود) ـ با بڵێین بەردە بەختیارەکە (الحجر الأسعد) ـ بۆ جێگەی پێشووی خۆی، کێشەیەکی گەورە لە نێوان هۆز و تیرەکاندا دروست بووبوو. چونکە هەر هۆزە و دەیویست ئەو شکۆیە بەر خۆی بکەوێت. خەریك بوو جەنگ و بەڵایەکی مەزن بەرپا ببێ، تا لە کۆتایدا گەیشتنە ڕێککەوتنێك: هەموو لایەك ناوبژیوانی و دادوەریی ئەو کەسەیان قبووڵ دەکرد کە یەکەم کەس دەهاتە ناو کەعبەوە. ئیتر هەمووان بە جارێ چاویان بڕیبووە دەروازەی بەیت و بە مەراقەوە چاوەڕێیان دەکرد یەکێك بێتە ژوورەوە. لەم نێوەندەشدا پێغەمبەری خوا ئاگای لە هیچ شتێك لەمانە نییە. جا هەر کە سیمای حەزرەتی موحەممەد - کە دڵنیایی دەبەخشی بە دۆست و دوژمن- لێیان بەدەرکەوت، گشتیان بە جارێ هاواریان کرد: " وا ئەمین هات" و ڕایانگەیاند کە ڕازین بە هەر حوکمێك ئەو بیدات...[1]

---

١- أحمد إبن حنبل، المسند ٤٢٥/٣ ـ حاكم، المستدرك ٦٢٨/١ ـ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٠٩/١.

بەڵێ ڕازی دەبوون، ئاخر چونکە متمانەی تەواویان پێی بوو. ئەگەر چی رسول الله(ﷺ) تا ئەو کاتە بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی ڕانەسپێررابوو، بەڵام کەسێك بوو جێی متمانەی هەمووان بوو و خاوەنی هەموو ئەو سیفەت و ئاکارانە بوو کە دەبوو لە پێغەمبەرێکدا هەبن.

بەڵێ، الفَضْلُ ما شَهِدَتْ بِه الأعْداءُ. " فەزڵ و گەورەیی ئەوەیە، دوژمن شایەتی بدات." ئەوەتا ئەبوو سوفیان ـ کە تا ئەو کاتە ـ سەرسەختترین دوژمنی پێغەمبەری خوا بوو، تەصدیقی ڕاست و دروستی سەروەرمان دەکات:

پێغەمبەری خوا لە ڕێگەی نێردەکانییەوە، نامەی بۆ پاشا و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە دەنارد. "هیرەقل" ئیمپراتۆری ڕۆمەکانیش، نامەیەکی لە پێغەمبەری خواوە بەدەست گەیشتبوو. هیرەقل نامەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە. ئەوجا ناردی بە شوێن ئەبوو سوفیاندا، کە لەو کاتەدا بە مەبەستی بازرگانی چوبووە شام. لە نێوانیاندا ئەم وتووێژەی خوارەوە ڕوویدا:

- ئەوانەی شوێنی دەکەون، زیاتر هەژارەکانن یان دەوڵەمەندەکان؟
- هەژارەکان.
- هیچ پاشگەزبوونەوەیەك ڕوویداوە لە نێو ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە؟
- تا ئێستا، نەخێر.
- لە زیاد بووندان یان کەم بوون؟
- ڕۆژ بەڕۆژ لە زیاد بووندان.
- لە ژیانیدا هیچ درۆیەکتان لێ بیستووە؟
- نەخێر، کەسمان درۆمان لێ نەبیستووە.

ئیتر هیرەقل لەتاو کاریگەریی نامەکە و ئەو وەڵامانەی لە ئەبوو سوفیانەوە بیستنی، کە تا ئەو کاتە دوژمنایەتی پێغەمبەری خوای دەکرد، خۆی پێنەگیرا و ئەم وتانەی لە زار هاتنە دەر:'کەسێك بە درێژایی ژیانی درۆی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردبێت، مەحاڵە ئێستا بەدەم خواوە درۆ بکات'."[1]

ئەم بەسەرهاتە ـ کە تەنها ئەو لایەنەیان باسکرد کە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە ـ دوو بەڵگەی تێدایە لەسەر ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوا. یەکەمیان هیرەقلی ئیمپراتۆری ڕۆمەکانە، کە لە سەرەوە قسەکانیمان تۆمار کرد. دووهەمیشیان وەڵامەکانی ئەبوو سوفیانە، کە تەسدیقی پێغەمبەری خوایان دەکرد، هەرچەندە تا ئەوکاتەش شەرەفمەند نەبووبوو بە ئیسلام.

ئەوەندە هەیە هیرەقل نەیتوانی زاڵ ببێت بەسەر عەشقی موڵك و دەسەڵاتەکەیدا و، موڵکێکی حەقیقی و ئەبەدی لە کیس خۆی دا کە تا بەردەستی هاتبوو. بەڵێ، هیرەقل موسوڵمان نەبوو و نەهاتە ڕیزی گرۆی بەختیارانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا قبووڵ کردنی ریسالەتی پێغەمبەری خوا و، ڕەفتار نواندنی بە ڕێز و حورمەتەوە، ئاماژەیە بۆ بەسیرەتی هیرەقل و، لە ڕوانگەی ئێمەشەوە دان پێدانانێکی دڵخۆشکەرە.. دانپیانان بە صیدق و صەداقەتی رسول الله دا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

لەڕاستیدا ناوەڕۆکی قسەکانی هیرەقل واتا و ئاماژەی قووڵیان تێدایە. ئاخر ئەگەر کەسێك تا تەمەنی چل ساڵیی تەنانەت بە گاڵتەش، تەنها

[1] - البخاري، بدء الوحي ٦ ـ مسلم، الجهاد: ٧٤.

درۆیەکی لەگەڵ کەسانی ئاسایدا نەکردبێ، چۆن دەکرێ لە دەمی نزیک بوونەوەی لە مەرگدا، درۆ بەدەم خواوە بکات!

"یاسر"بەر لە موسوڵمان بوونی، پرسیاری لە"عەممار"ی کوڕی کرد کە بۆ کوێ دەچێ. عەمماریش لە وەڵامدا وتی: " بۆ لای موحەممەد."

ئەم وەڵامە بەس بوو بۆ عەممار: " ئەو ئەمینە. خەڵکی مەککە وا دەیناسن. ئەگەر وتبێتی پێغەمبەرم ئەوە پێغەمبەرە. چونکە هیچ کەس درۆی لێ نەبیستووە."

ئەمە قسە و قەناعەتی چەند کەسێك نەبووە، بەڵکو بۆچوونی هاوبەشی هەموو ئەوانە بووە کە لە کاتی پێغەمبەرایەتی و پێش بوون بە پێغەمبەریشدا ناسیویانە.

## ج ـ هەمیشە ئامۆژگاریی ڕاست ڕەویی دەکرد

پێغەمبەری خوا هەروەك چۆن ڕێك و ڕاست دەژیا، ئاوهاش ئامۆژگاریی بەردەوامی ئوممەتەکەی دەکرد تا سەرڕاست و ڕاستبێژ بن. جا لێرەدا بە مەبەستی بەهرەمەند بوون لە فەرو بەرەکەتی ئەو فەرموودانە، هەندێکیان بە نموونە دەهێنینەوە:

اِضْمَنُوا لِي سِتًّا مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَضْمَنْ لَكُمُ الْجَنَّةَ: اُصْدُقُوا إِذَا حَدَّثْتُمْ، وَأَوْفُوا إِذَا وَعَدْتُمْ، وَأَدُّوا إِذَا أُؤْتُمِنْتُمْ، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، وَغُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُمْ.[1]

---

١ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٣٢٣/٥ ـ الطبراني، المعجم الكبير ٢٦٢/٨ ـ المعجم الأوسط ٧٧/٣ ـ البيهقي، السنن ٢٨٨/٦.

" شەش شتم لە خۆتاندا بۆ مسۆگەر بکەن، منیش چوونە بەهەشتتان بۆ مسۆگەر دەکەم:

- کە قسەتان کرد، ڕاستگۆ بن.
- کە پەیمانتان دا، بیبەنە سەر.
- ئەمین و دەستپاك بن.
- داوێنتان بپارێزن.
- چاوتان لەئاست حەرامدا بپۆشن.
- دەستتان لە حەرام بەدوور بگرن."

بەڵێ، پێغەمبەری خوا تیرئاسا هەمیشە ڕێك و ڕاست ژیاوە. داوای دەکرد هەمووانیش هەر بەو شێوەیە بژین. تەنانەت بەو "صەداقەت"ە تایبەتییەی خۆی، گەیشتە خاڵێك کە لە نێوان "ئیمکان" و "وجوب"دا بوو. ئیتر ئەمە خاڵێك بوو کە لەودیوییەوە تەنها و تەنها "صیدقی ئیلاهی" هەبوو. بە دەربڕینێکی تر، رسول الله(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) لە ڕاستی و دروستیشدا، بە نێو ئاسۆی ﴿قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾(النجم: ٩) دا سەیر و سلووکی دەکرد. بەڵێ، ڕاستە ئەو لە ڕوویەکەوە لە بازنەی "ئیمکان"دا بوو، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە جیهانی ئیمکانی تێ پەڕاندبوو. هەروەك "قازی عەیاض" لە باسی میعراج دا دەڵێ: " حەزرەتی موحەممەد گەیشتە شوێنێك نەیدەزانی پێی لە کوێدا دابنێ. پێی وترا: 'پێیەکت لەسەر پێیەکەی ترت دابنێ'." بەڵێ ئەو لە هەموو ڕوویەکەوە مرۆڤ بوو، بەڵام ڕاستیی و دروستییەکەی بۆ وەها پلەیەك بەرزیان کردبووەوە. ئامۆژگاری ئێمەش دەکات لەسەر هەمان خەسڵەت و دەفەرموێ:

" بەڵێنی ڕاستبێژیم بدەنێ و درۆ ئاوێتەی ژیانتـان مەکـەن، منـیش بـەڵێنی بەهەشتتان دەدەمێ."

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ:

دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ، فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ. [1]

" واز بێنە لە شتێك کە گومانی لێدەکەی، بۆ شتێك کە گومانت لێی نییـە. چونکە ڕاستگۆیی دڵنیاییە و درۆش گومان و دڵەڕاوکێیە."

هەروەها دەفەرموێ:

تَحَرَّوا الصِّدْقَ وَإِنْ رَأَيْتُمْ أَنَّ فِيهِ الْهَلَكَةَ فَإِنَّ فِيهِ النَّجَاةَ. [2] " هەردەم بەشوێن ڕاستیدا بڕۆن، تەنانەت ئەگەر لاشتان وا بوو بە هۆیەوە تیا دەچن، بزانن کـە ڕزگار بوونی تێدایە."

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ:

عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ. وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقاً. وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يُكَذِّبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّاباً. [3]

" پێویستە ڕاستگۆ بن، چونکە ڕاستگۆیی ڕێ پیشاندەرە بـەرەو چـاکە، چاکەیش ڕێ نیشاندەرە بەرەو بەهەشت. کەسی وا هەیە بەردەوام ڕاست دەڵێ

---

١ - الترمذي، القيامة ٦٠ ـ النسائي، الأشربة ٥٠ ـ الدارمي، البيوع ٢.

٢- إبن أبي الدنيا، الصمت ٢٢٧ ـ مكارم الأخلاق ٥١ ـ هناد، الزهد ٦٣٥/٢.

٣- البخاري، اللباس ٦٩، الادب ٦٩ ـ مسلم، البر ١٠٣-١٠٥.

و به دوای ڕاستی و ڕاستگۆییدا دەگەڕێ هەتاوەکو لەلای خوا بە ڕاستگۆ (صِدِّیق) دەنووسرێ. نەکەن هەرگیز درۆ بکەن. چونکە درۆکردن سەردەکێشێ بۆ خراپە و بەدڕەفتاریی، خراپەکاریش ڕێی دۆزەخ پیشان دەدا. کەسی وا هەیە هەمیشە درۆ دەکات و، بەدوای گوفتار و کرداری درۆدا وێڵە، تا ئەوەی لەلای خوا بە درۆزن (کَذَّاب) تۆمار دەکرێ."

ڕزگار بوون و سەرفرازی لە ڕاستگۆییدایە. مرۆڤ ئەگەر بشمرێت لە پێناو ڕاستیدا، ئەوا تەنها یەك جار دەمرێت. کەچی هەر درۆیەك بۆ خۆی مردنێکە.

کەعبی کوڕی مالیك(ﷺ) دەفەرموێ: " من بەهۆی ڕاستگۆییمەوە ڕزگارم بوو." بەڵێ، هەرکات باس لە ڕاستگۆیی دەکرێت، مەحاڵە ئەومان بە بیردا نەیەت.

کەعبی کوڕی مالیك(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بلیمەتێکی ئەوتۆ بوو، وتەکانی هێندەی شمشێرەکەی و، شمشێرەکەشی هێندەی وتەکانی تیژ و بڕندە بوو. شاعیر و قسەزانێکی بەتوانا بوو. بە شیعرەکانی ورەی کافرانی سەرەوژێر دەکرد. یەکێکیش بوو لەوانەی لە عەقەبەدا بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دابوو. بۆیە بە یەکێك لە پێشەنگەکانی ئەنصار دادەنرا. بەڵام ئەم هاوەڵە بەڕێزە نەیتوانی بەشداریی غەزای تەبووك بکات. تەبووك جەنگێکی سەخت و تاقەت پرووکێن بوو. لەم جەنگەدا مشتێك مرۆڤ لەگەڵ سوپای بێ شوماری ڕۆمدا، هەم لە جەرگەی بیابانی وشك و هەڵقرچێنەردا دەستەویەخە دەهات. بەم نیاز و خەیاڵەوە کەوتنە ڕێ و ئەو قارەمانێتییەیان نواند. ئەوان پاداشتی ئەمەیان بۆ نووسرا، بەڵام پێکدادان ڕووی نەدا و ئەو جەنگە ترسناکەش تەنها لە یادگەکاندا مایەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەموو غەزاکانی تردا، جوولە سەربازییەکانی بە نهێنی دەهێشتەوە، کەچی ئەم جارەیان بە ئاشکرا کەوتە ڕێ و هەمووانی بانگهێشت کرد بۆ جیهاد. کەچی کەعب سەرەڕای ئەم بانگەوازە ئاشکرایەش، هەر بەشدار نەبوو. ئێستا با لە زاری خۆیەوە کورتەیەك لە بەسەرهاتەکەی ببیستین:

" هەمووان بۆ ئەم جەنگە بانگهێشت کران. دیاربوو جەنگێکی دژوار لە پێشدا بوو. بەڵام خوای گەورە تەقدیری نەکردبوو پێکدادان ڕوو بدات، بۆیە ئەم جوولە سەربازییە تەنها لە چوارچێوەی ئەزموونێکی پراکتیکیدا مایەوە. جا نازانم پێغەمبەری خوا لە سەرەنجامی جەنگەکە ئاگادار کرابووەوە یان نا، بەڵام بایەخێکی جیاوازی بەم غەزایە دەدا.

منیش وەك هەرکەسێکی تر، ئامادەکاریەکانم تەواوکرد. تەنانەت تا ئەو ڕۆژە بۆ هیچ غەزایەکی تر ئاوا خۆم بە چاکی ئامادە نەکردبوو. زۆری نەبرد سەروەری هەردوو دنیا(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) فەرمانی جوولەی دا و سوپا کەوتە ڕێ. منیش هەر بەخۆم دەوت: " هەرچۆنێك بێت پێیان دەگەمەوە." لەم ڕووەوە متمانەم بەخۆم هەبوو. هیچ سەرقاڵییەکیشم نەبوو، کەچی هەر دەموت: " ئەمڕۆ نا سبەی.." هەتا ڕۆژان تێپەڕین و، گەیشتنەوەم بە رسول الله بوو بە کارێکی مەحاڵ. ئیتر دەبووایە بە ناچاری چاوەڕێم بکردایە.. کردیشم. بەڵام چ چاوەڕوانییەك! هەر سەعاتێکی بە چەندان ڕۆژ لێم دەڕۆیشت.

سەرەنجام هەواڵی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا لە هەموو لایەکەوە بیسترا. جاخۆ هەموو جارێك هەر وابوو، هەر کە دەنگوباسی نزیکیی هاتنەوەی بڵاودەبووەوە، مەدینە سەرلەنوێ دەبووژایەوە. ئێستاش خەندە و شادی لەسەر ڕوخساری هەمووانە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگەڕایەوە...

لەکۆتایدا ساتی چاوەڕوانکراو هات. سوپای موسولّمانان گەیشتەوە مەدینە. پێغەمبەری خواش(ﷺ) وەك نەریتی خۆی، سەرەتا سەردانی مزگەوتی کرد و دوای دوو ڕکات نوێژ، دەستی کرد بە پێشوازی کردنی موسولّمانان. خەلّکی پەیتا پەیتا دەهاتنە خزمەتی. ئەوانەش کە بەشدارییان نەکردبوو، بیانوویان دەهێنایەوە. تەنانەت زۆرێك لەوانەی حالّیان وەك من بوو، بیانوویان دەهێنایەوە و پێغەمبەری خواش بیانووەکەی قبوولّ دەکردن. جا خۆ منیش دەمتوانی هەمان شت بکەم، چونکە لە ڕووی توانای قەناعەت پێهێنان و قسەسازیەوە لە هەموویان شارەزاتر بووم. بەلاّم بەبێ بوونی هیچ عوزرێك، چۆن دەکرا لەگەلّ پێغەمبەری خوادا درۆ بکەم. درۆم نەکرد.. نەمتوانی درۆ بکەم. کە چوومە حزووری، بە بزەیەکی سەرزەنشت ئامێزەوە کە دلّی کوناودەر کردم، ڕووی تێکردم و فەرمووی: 'لە کوێ بوویت؟' منیش بە بێ کەم و زیاد، حالّەتەکەم چۆن بوو ئاوا بۆم گێڕایەوە. لەپاش قسەکانم، ڕووی لێ وەرگێڕام و لەژێر لێوەوە فەرمووی: 'هەستە بڕۆ' ئیتر منیش بەم حالّەوە چوومە دەرەوە. کە هۆزەکەم منیان بەم حالّەوە دی، دەوریان لێدام و هانیان دەدام منیش بیانوویەك بدۆزمەوە تا خۆمی پێ دەرباز بکەم. تەنانەت وەك بلّێی قسەکانیان تاوێك لە دلّمدا جێی خۆیان کردەوە. بەلاّم یەکسەر هاتمەوە خۆم و، پرسیم: 'هیچ کەسێکی تر هەیە وەك من بێت؟' لە وەلاّمدا ناوی دوو کەسی تریان پێ وتم: "مورارەی کوڕی ڕەبیع" و"هیلالی کوڕی ئومەییە". هەردووکیان دوو صەحابی ناسراویش بوون و لە بەشداربوانی بەدر بوون. بەلّێ، ئەوانیش هیچ بیانوویەکیان نەهێنابووەوە و کەوتبوونە حالّی منەوە-أستغفر الله، چووبوونە هۆلّی چاوەڕوانییەوە- هەردووکیان کەسانێك بوون شایانی چاولێکردن بوون. بۆیە منیش بڕیارمدا وەك ئەوان بم و هیچ عوزرێك نەهێنمەوە.

لەو ماوەیەدا فەرمانێك سەبارەت بە هەرسێكمان دەرچوو. ئیتر لـەوە دوا هیچ موسوڵمانێك قسەی لەگەڵـدا نـەدەكردین. هـەردوو هاوەڵەكـەم خۆیـان خزاندە ماڵەكانیانەوە و شەو و ڕۆژ بەبێ وەستان دەگریان. جا لەبەر ئەوەی من گەنجترینیان بووم، دەچوومە دەرەوە و لـە كـاتی نوێژەكانیشـدا لـە مزگـەوت ئامادە دەبووم. بەڵام هیچ كەس نەیدەدواندم. زۆربەی كاتەكانم لـە مزگـەوت بەسەر دەبرد. جاری وا دەبوو، بۆ بینینی خەندەیـەكی پێغەمبـەری خـوا بـە ڕوومدا، چەندین ماوەی دوور و درێژ چـاوەڕوانیم دەكـرد.. بـەڵام هـەیهات: هەموو جارەكان بە دڵشكاویی دەگەڕامەوە. ئەو زاتەی كە هەرگیز خەندە لـە ڕوخساری نەدەبڕا، بۆ جارێكیش بێ، تەماشای نەكردم و بزەیەكی بە ڕوومـدا نەنواند. زۆرجار كە سەلامم دەكرد، چاوم دەبڕییـە لێوەكـانی تـا بـزانم هـیچ جووڵەیەك دەكا یان نا. بەڵام وەرە ببینە، بچووكترین جووڵەشی نەدەكرد. زۆر جار كە نوێژم دەكرد، بە لاچاوێك تەماشام دەكرد. كاتێك دەسـتم دەكـرد بـە نوێژ تەماشای دەكردم، بەڵام هەر كە لە نوێژ تەواو دەبووم، یەكسەر نیگاكانی لێ بزر دەكردم. پەنجا ڕۆژی ڕەبەق ئاوا تێدەپەڕی. ئیدی كەسەكان، جێگەكان هێندە نامۆ بووبوون لە بەرچاوم، وامدەزانی لە وڵاتێكی بێگانەدام.

ڕۆژێكیـان چـووم بـۆ بینینـی " ئـەبوو قـەتادە"ی ئـامۆزام، كـە زۆرم خۆشدەویست و ئەویش منی وەك گیـانی خـۆی خۆشدەویسـت. لـە دیـواری باخەكەیەوە خۆم هەڵدایە ژوورەوە و چـووم بـۆ لای. سـەلامم لێكـرد، بـەڵام وەڵامی سەلامەكەمی نەدایەوە. لێم پرسی: 'بۆ خوا بڵێ، باوەڕ ناكەی كە خوا و پێغەمبەرەكەیم خۆشدەوێت؟' ئەمجاریش هیچ وەڵامێكی نەدامەوە. سێ جار ئەم پرسیارەم لێ دووبـارە كـردەوە، تـا لـە جـاری سـێهەمدا وتـی: 'خـوا و پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن.' ئەمەی وت و بەجێی هێشتم. دەتـوت دنیـام بەسەردا ڕووخاوە، ئاخر هەرگیز چاوەڕوانی هەڵوێستی وام لـە ئـەبوو قـەتادە نەدەكرد. دڵم پڕ بوو و دامە پڕمەی گریان.

جارێکیشیان که لـه کۆڵانـەکانی مەدینـەدا دەسـوڕامەوە، گـوێم لێبـوو پیاوێك سۆراغی منی دەکرد. خەڵکەکەش منیان پیشاندا. پیاوەکە هاتە لام و نامەیەکیشی بەدەستەوە بوو. نامەکە لەلایەن "پاشای غەسسان"ەوە بۆ مـن نێررابوو. پاشا لـه نامەکەیـدا بانگهێشـتی دەکـردم بـۆ مەملەکەتەکـەی و نووسیبووی: 'بیستوومە هاوەڵەکەت دەستبەردارت بووە و دایبڕیویت. جا بۆیە وەرە لای ئێمە، چونکە کەسانی وەك تۆ لای ئێمە قەدرو قیمەتیان بـەرزە..' دوای خوێندنەوەی نامەکە، لە دڵی خۆمدا وتم: "ئەمەش تاقیکردنەوەیـەکی ترە." بۆیە نامەکەم دڕاند و خستمە ناو ئاگرەوە.

چلەمین ڕۆژ بوو. پێغەمبەری خوا کەسێکی نارد تا پێمان ڕابگەیەنێت کە پێویستە لە خێزانەکانمان دوور بکەوینەوە. منیش بە نێرراوەکەم ووت: 'چی بکەم، تەلاقی بدەم؟' ـ ئای بە قوربانی وەفـــای بم ـ فەرمووبووی کە تەنها لێیان بەدوور بین. ئیتر بە خێزانەکەم وت کە بچێتەوەماڵی باوکی. لەم نێوەندەشدا خێزانەکەی هیلال بە مەرجی خزمەتکردنی هاوسەرەکەی، داوای مۆڵەتی کردبوو. چونکە هیلال کەسێکی بەتەمەن بوو و نەیدەتوانی ئیشەکانی خۆی ڕابپەڕێنێت. پێغەمبەری خواش مۆڵەتی دابوو. هەندێك کەسیش پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردم منیش هەمان شت بکەم. بەڵام قبووڵم نەکرد. ڕاستییەکەی نەمدەزانی هەڵوێستی پێغەمبەری خوا لە بەرامبەر تەکلیفێکی وادا چۆن دەبێت.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت. پەنجا ڕۆژی تەواومان بەم شێوەیە بردە سەر. نەمدەتوانی چیتر بەرگە بگرم. دنیام لێ هاتبووەوە یەك و هێندەی گۆڕ تەنگ و تاریك بووبوو. ڕۆژێکیان هەروەك ڕۆژانی تر، نوێژی بـەیانیم کردبـوو و لـە بانیژەی خانووەکەمدا دانیشتبووم. گوێم لێبوو یەکێك بە دەنگی بەرز نـاوی منی دەهێنا. دەنگەکە دەیوت: 'مژدەت لێبێ کەعب' ئیتر هەر کـە ئەمـەم

بیست، یەکسەر زانیم مەسەلە چییە. بۆیە ڕاستەوخۆ چوومە سوجدەوە. ئەو ڕۆژە لە دوای نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا لێخۆشبوونمانی ڕاگەیاندبوو. بە پەلە بەرەو مزگەوت ڕامکرد. هەموویان بە پێوە وەستابوون و پیرۆزباییان لێ دەکردم. "تەڵحە" باوەشی پیاکردم و ماچی دەکردم. وام هەست دەکرد سەرلەنوێ لە عەقەبەدام. ئەوجا چوومە حزووری فەخری کائینات و دەستی موبارەکیم گرت، ئەویش دەستی منی گرت ـ وا دەزانم ئەگەر لەو کاتەدا مزگێنی بەهەشتیشی پێ بدرایە، بەو ئەندازەیە دڵخۆش نەدەبوو- ئینجا فەرمووی: 'خوای گەورە لێتان خۆشبوو.' بەدویدا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە سەبارەت بە ئێمە دابەزیبوو:

﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾(التوبة: ١١٨)

" هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبووک) دواخران دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بووەوە، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەک نییە (لەخەشم و قینی خوا بیانپارێزێت) جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن، تا تەوبە بکەن، بەڕاستی هەر خوا تەوبە وەرگر و میهرەبانە."

لەپاش ئەوەی رسول الله(ﷺ) ئایەتەکەی تەواو کرد، عەرزم کرد: " یا رسول الله، من بە ڕاستگۆیی ڕزگارم بوو.. پەیمانیش دەدەم تا لە ژیاندا بم، جگە لە ڕاستیی چی تر نەڵێم." [١]

---

١ - البخاري، المغازي ٧٩ ـ مسلم، التوبة ٥٣-٥٥.

بەڵێ، حەقیقەتی نبووەت لەسەر بنچینەی "صدق" واتە ڕاستگۆیی و ڕاستڕەوی دارێژراوە. هەموو پێغەمبەران ڕاستگۆن، پێویستیشە ڕاستگۆ بن. چونکە ئەگەر بچووکترین هەڵە یان لاری لە هەر یەکێك لەم زاتانەدا هەبێت، کە لە جیهانی غەیبەوە فەرمانەکان دێنن و بە مرۆڤایەتی دەگەیەنن، ئەوا هەموو شتێك سەرنخوون دەبێتەوە. ئەوەتا سەرجەم ئەو ڕاستییانەی کە دەبێت دەربارەی مرۆڤایەتی بیزانین، لە ڕێگەی ئەم مرۆڤە بژاردانەوە پێمان دەگات. ئەمەش بابەتێکی هێندە هەستیارە، بچووکترین هەڵە هەڵناگرێت. بۆیە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَـٰجِزِينَ﴾ (الحاقة: ٤٤-٤٧)

" خۆ ئەگەر (محمد صلی الله علیه وسلم) هەندێک قسە و گوفتاری بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە، ئەوا بە هێز و دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت. ئەوسا هیچ کەسێک نییە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بکات لە ئێمە."

بەڕاستی پێغەمبەری خوا لە بەرامبەر ئەمر و نەهییەکانی خوای گەورەدا، وەك مردوویەك وا بوو لە دەستی مردوو شۆردا. وەحی بەرەو چ ئاڕاستەیەك بیویستایە وەری دەگێڕا، ئیتر ئەویش هەتاهەتایە لەسەر ئەو ئاڕاستەیە دەمایەوە. تەنانەت ئەو کاتەش کە "قورییەت"ی بەدەست هێنا و گەیشتە خاڵی کۆتایی، تۆسقاڵێك لەم هەستیارییەی لەدەست نەدابوو. لەدەستدان با لە لایەکەوە بوەستێت، بگرە قووڵتر بووبووەوە و گەیشتبووە ئاستێك کە لە توانای کەسدا نەبێت پێی بگات.

## د ـ خاوەنی قسەی خۆی بوو

تا تەمەنی چل ساڵیی نە کەس دیویەتی و نە کەسیش بیستوویەتی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) قسەیەکی دوور لە ڕاستی بکات. زاتێك کە لە دوایدا بە شەرەفی صەحابی بوون دەگەیشت، دەگێڕێتەوە: " لە سەردەمی نەفامیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ڕێککەوتین کە لە فلاّنە جێدا یەکتر ببینین ـ هەروەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، جاهیلیەت ناوی ئەو سەردەمە بوو کە ئەوی تیادا دەژیا. دەنا ئەو مرۆڤە دڵ و ویژدان ڕۆشنە، هەرگیز لە جەهالەتدا نەژیاوە. بەڵکو هەمیشە لە چوارچێوەی ژیانێکی پێغەمبەرانەدا ژیاوە ـ بەلاّم من بەڵێنەکەم لەیاد کردبوو. لە پاش سێ ڕۆژ کە بە بیرم هاتەوە، بە پەلە بەرەو شوێنی دیاریکراو ڕۆیشتم. دەبینم وا پێغەمبەری خوا لەوێ لە چاوەڕوانیدایە. نە ڕوخساری بەڕوومدا گرژ کرد، نە لێشم زویر بوو. تەنها ئەوەندەی پێ وتم: 'ئەی گەنج، ماندووت کردم. سێ ڕۆژە لێرە چاوەڕوانیت دەکەم'." [1]

## هـ ـ فەرمایشتەکانی تەصدیقی دەکەن

ئەو هەر لە لەدایك بوونییەوە حەزرەتی موحەممەد موستەفا بوو. هەر بۆیە لەپاش پێغەمبەرایەتیش چیی بووتایە، خەڵکی بە دڵ و بە گیان باوەڕیان پێ دەهێنا و پشتڕاستیان دەکردەوە. بەڵێ، سەرانسەری گەردوون تەصدیقی دەکرد و لە بەرامبەریدا دەیوت: صَدَقْتَ یا رسول الله. " ڕاستت فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا" لەمەشدا مرۆڤەکان تەنها نەبوون، بەڵکو بە زمانی موعجیزەکان، هەر "جۆر"ە و نوێنەری خۆی دەنارد و، وەك بلێی بەیعەتیان پێ دەدا.

---

١ - أبو داود، الأدب ٨٢ ـ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٥٩/٧.

لێرەدا دەمەوێت کەوانەیەك بکەمەوە و تیشك بخەمە سەر بابەتێك کە بە گرنگــی دەزانم: دەربڕینــە نوورانییــەکانی قورئــانی پــیرۆز و فەرمایشــتە بەنرخەکانی سەروەرمان(ﷺ) لە ڕووی ڕەچـاوکردنی پەیوەنـدیی نێـوان زات و سیفات و ئەسمائەوە، دارای پلەیەکی هێندە بەرزن، کە نە فەیلەسووفەکان لــە ڕێگەی عەقڵەوە و، نە ئەولیاکانیش بە هەنگاوەکانی دڵ و، نە ئەصفیاش بــە ڕەهەندی ڕۆح، نەیانتوانیوە- و ناشتوانن- بگەنە ئاستێکی وەهــا لــە دەرك و دەربڕین.

بەڵێ، ئەم ڕۆحە بەرزانە لە دەمی ســەرکەوتنیان بــە پلــەکانی کەمالـدا، هەمیشە پیشانیانداوە و پیشانیشی دەدەن کە ئەوان هەر دەڕۆن و دەڕۆن، لــە کۆتــایی هــەر مەنزڵێکیشــدا کــە پێــی دەگــەن، ڕاســتی و دروســتیی فەرمایشــتەکانی قورئــان و ســوننەتیان بــۆ دەردەکــەوێت و، بــە کەشــف و موشاهەدەوە چێژی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا دەکەن.

بەڵێ، هەموو ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا سەبارەت بە ئولوهییەت (خوایەتی) فەرمووني، وا ئەمڕۆ لە لایەن شارەزایانی ئەو بوارەوە دانــە تەصدیق دەکرێن و، دەکرێنە بناغە و بنچینەی لێکۆڵینەوەکانیان. تەنانەت لە باسی خوایەتی و حەشر و زیندوو بوونەوە و قەدەردا، لە کۆمەڵە مەسەلەیەکی هێندە هەستیار و ورد دواوە- لەگەڵ پاراستنی هاوســەنگی نێوانیــان- کــە پێشینەکان و پاشینەکانیش نەك هەر دەستەوسانن لە پەی پێ بردنیدا، بەڵکو ئەگەر گریمانەی"نەبوون"ی ئەو فەرموودە نوورینانــە بکــەین، ئــەوا هیچــیان نەیاندەتوانی لەم بوارەدا تاکە وشەیەکیش بڵێن.

لە حەزرەتــی عومەر و عەمری کوڕی ئەختــاب(ﷺ) دەگێڕنــەوە: " ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا دوای نوێژی بەیانی سەرکەوتە سەر مینبەر و هەتا نیوەڕۆ وتاری بۆ داین. ئینجا نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین و دووبارە چووەوە سەر

مینبەر و تا عەسر بەردەوام بوو. لەپاش نوێژی عەسریش، سەرلەنوێ چووەوە سەر مینبەر و تا کاتی خۆرئاوابوون وتاری بۆ داین. باسی چیی کرد و دەربارەی چی دوا؟ تێگەیشتن لە هەمووی زۆر زەحمەتە. بەڵام دەتوانرێت بوترێت باسی هەموو ئەو شتانەی کرد کە تا ئەو کاتە باس نەکرابوون. بەڵێ، لە بەدیهێنانی یەکەمەوە دەستی پێکرد. هەر لە یەکەم تۆوەوە کە لە ڕەحمی بووندا چێنرا، تا خەلقی گەردوون و، بەدیهێنانی مرۆڤ و، قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی خەلق. دواتر دانە دانەی ئەو ڕووداوانەی باسکرد، کە تا ڕۆژی قیامەت بەسەر مرۆڤایەتیدا دێن." [1]

بەڵێ، ئەو پێغەمبەرە نازدارە(ﷺ) قوڵاییەکانی ڕابردووی تەی کرد و، باسی تایبەتمەندی و سیفەتی هەموو پێغەمبەران - تا دەگاتە حەزرەتی ئادەم- ی کرد. ئەوجا ڕوانینی ئاراستەی داهاتوو کرد و، هەموو دیمەنەکانی تا مەحشەر و بەهەشت و جەهەننەمی خستەڕوو. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو هیچ کتێبێکی نەخوێندبووەوە و زانیاریشی لە کەس وەرنەگرتبوو. دەی کەوابێ هەموو ئەم شتانەی چۆن دەزانی؟ بەڵێ، یەکێك هەبوو کە هەموو ئەم شتانەی فێر دەکرد، بێ گومان ئەویش زاتی الله(جَلَّجَلَالُهُ) بوو کە بە هەموو شتێك زانا بوو...

ئەو بابەتانەی باسی لێوە دەکردن، هەر لە عەرشەوە تا فەرش، لەوێشەوە تا قوڵاییەکانی زەوی، هەر هەمووی لە لایەن " گوتارێژی ئەزەلی"یەوە فێردەکرا. تەنانەت مرۆڤی ئەم سەردەمەش باوەڕی وایە کە مومکین نییە ئەو زانیاریانە بە ڕێگەیەکی تر بەدەست بێن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی ترە لەسەر ڕاستبێژیی ڕەسوولی ئەکرەم(صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ).

---

١ - البخاري، بدء الخلق ١ ـ مسلم، الفتن ٢٥ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٣٤١/٥.

سەروەرمان باس لە پێغەمبەرانی پێش خۆی دەکات و، ئەدگارەکانیان دەناسێنێت و هەروەکو تابلۆیەك ـ بە هێڵەکانی رووخساریشیانەوە ـ دەیانخاتە پێش چاوان.[1] ئەهلی کیتابی ئەو سەردەمەش بێ هیچ رەخنەیەك هەموو ئەمانەیان قبووڵ دەکرد و دەیانووت: "بەڵێ وایە، وەسفی پێغەمبەران لەکتێبەکانی ئێمەشدا هەر وا هاتووە."[2] جا ئایا کەسێك کە تەورات و ئینجیل یان کتێبێکی تری نەخوێندبێتەوە و، پێغەمبەرانی پێش خۆی هەم بە وردترین شێوە و بەو چۆنێتییەی کە لە کتێبەکانی پێشوودا باسکراوە ـ تەنانەت ئەو شتانەش کە لەواندا باس نەکراوە ـ وەسف بکات و، لەم کارەشیدا لە لایەن شارەزایانی ئەم بوارەوە تەصدیق بکرێت، ئایا ئەمە نابێتە شاهید و بەڵگە لەسەر صیدقی رسول الله و راستیی دەعواکەی؟!

روونکردنەوەی ئەو چەند لایەنەی کە هەوڵماندا لە نێو کەوانەیەکدا عەرزیان بکەین، سنووری توانستی من تێپەڕ دەکات. وا نازانم خوێنەریش- کە حاڵی وەك حاڵی منە ـ زۆر لەمە جیاوازتر بێت. بەڵێ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە ئاستێك کە لەم جۆرە بابەتانە تێبگات و کەسانی تریش تێبگەیەنێت، سەرەتا پێویستە خودی خۆی بگاتە پلەی تەصدیقی ئەو بابەتانە. بەڵام ئێمە پاڵپشت بە وتەی ئەو کەسانەی کە باوەڕمان وایە ئەم پایەیەیان بەدەست هێناوە، دەڵێین: شایەتی دانی سەدان هەزار ئەولیا و ئەصفیا کە پلە پلە لە بەرز بوونەوەدان و، ئەو فەیلەسوف و دانایانەش کە هزریان بە زانست رۆشن بووەتەوە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا لە هەر بابەتێك دوابێت،

---

١ - بۆ نموونە بڕواننە: البخاري، الأنبياء ٢٤ ـ مسلم، الأيمان ٢٦٦- ٢٧٨.

٢ - إبن هشام، السيرة النبوية ٢٧/٢ ـ البيهقي، دلائل النبوة ٧٤/٢- ١٠٠ ـ الحلبي، السيرة الحلبية ٢٩٨/١.

فەرمایشتەکانی لـە لوتکـەی ئـەو بابەتـەدان، مەودایـەکی تـری صـیدق و ڕاستڕەویی ئەو پێك دەهێنێت.

بەڵێ، دان پیانانی ئەم کەسە بژاردانەش پیشانی دەدات کە پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) لە هیچ گوفتارێکیدا پێچەوانەی واقیع نەدواوە. جاخۆ قسەکانی لە خۆیەوە نەبوون، تا نادروستی توخنی بکەوێت! ئەو هەردەم دەمی بە پەیامە ئاسمانییەکان پشکوتبوو و، وتەکانی ببوونە ئاوێنەی بێگەردی وەحی. هەر لەبەر ئەمەیە کە بووەتە "سوڵتانی وتە"ی هەموو زەمان و مەکانێك.[1]

ئەو لایەنەی لێرەدا دەمانەوێت زیاتر لەسەری بوەستین، ئەو هەواڵە غەیبییانەیە کە تایبەتە بە چەند ڕووداوێکی داهاتووەوە و پێش چواردە سەدە، پێغەمبەری خوا ئاماژەی پێداون و، کە کاتیشی هاتووە، وەك خۆی ڕوویانداوە. بێگومان هەریەك لەم ڕووداوانەش ڕاست و دروستیی حەزرەتی موحەممەد(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەردەخەن. بەڵام بەر لەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە، مەسەلەیەك هەیە پێم باشە کەمێك هەڵوێستەی لەسەر بکەین، ئەویش لێکدانەوە جیاوازەکانە سەبارەت بە مەسەلەی"غەیب" بەڵێ، ئەمەش لەو بابەتە هەستیارانەیە کە پێویستە بە وردی و سەرنجەوە توێژینەوەی لەمەڕ بکرێت.

---

١ - ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ (النجم: ٣-٤) " قسە و گوفتاری لە ئارەزوو و هەوەسەوە نییە. بەڵکو تەنها نیگا و وەحیی خواییە."

# غەیب لە ڕوانگەی صیدقەوە

وشەی"غەیب" لە قورئانی پیرۆزدا، لە چەندین ئایەتدا و بە شێوە جیاوازەکانییەوە باسکراوە:

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مُّبِينٍ﴾ (الأنعام: ٥٩)

" کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنییەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر وشکانییە (لە گیاندار و بێ گیان و گیا و دار و زیندەوەرانی ورد و درشت لەسەر زەوی و لە توێی خاکدا) خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆر و ماسی سەیر و سەمەرە) ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەک ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنکێک یان توێیەک لە تاریکایەکانی زەویدا نییە، ئەو دەنکە چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نیە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتیدا تۆمار نەکرابێت ."

لەم ئایەتەدا باس لەوە کراوە کە "غەیب" بە تەواوی لەلای خوای گەورەیە و غەیری ئەو ـ بە حەزرەتی موحەممەدیشەوە ـ کەسی تر نایزانێت. مەگەر خوای گەورە خۆی سەروەرمان بەم شێوەیە ناهێنێتە ئاخاوتن؟

﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾ (الأنعام: ٥٠)

" ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لە نهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادار نیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی من فریشتەم، بەڵکو تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کە بە وەحی و نیگا پێم دەگات، (هەروەها) پێیان بڵێ: ئایا کوێر و چاوساغ وەک یەکن؟ ئایا بۆ بیرناکەنەوە و تێنافکرن (لەو ڕاستییانە)."

﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الاعراف: ١٨٨)

" ئەی محمد(صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێک بەخۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، خۆ ئەگەر غەیبم بزانیایە ئەوا چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆ خۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێک نیم تەنیا ترسێنەرێک (بۆ یاخییەکان) و مژدەدەریشم بۆ کەسانێک کە باوەڕ دەهێنن."

لە سورەتی "الجن"یشدا بەم شێوەیە هاتووە:

﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ۝ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ۝ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا﴾ (الجن: ٢٦-٢٨)

" ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات. مەگەر بۆ پێغەمبەرێک خوا خۆی ڕازی بێت ، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە، تا خوا چاک بزانێت و ئاگادار بێت لەوەی بەڕێکوپێکی پەیام و ڕێنموویی پەروەردگاریان گەیاندووە، هەرچەندە خوا

بەهەموو ئەو شتانەش ئاگادارە کە کردوویانە و پێی هەستاون و هەموو شتێک لای ئەو زاتە بەژمارە ئامار کراوە."

ئێستاش لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا، دەتوانین شیکارێکی لەم جۆرە بکەین: بانگەشەکردنی ئەوەی کە " پێغەمبەری خوا بە ڕەهایی غەیبی دەزانی." زیادەڕەوییە. هەروەك چۆن ئەوەی بووترێت " هیچ غەیبی نەدەزانی." کورتڕەوییە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خۆیەوە غەیبی نەدەزانی، بەڵام لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوە و هەواڵ پێدانی پەروەردگارییەوە، بە شێوەیەك دەیزانی ـ هەروەك زانیشی ـ هەر دەتوت لەبەردەم شاشەیەکدا دانیشتووەو سەرجەم ئەو ڕووداوانەی کە تا ڕۆژی قیامەت ڕوودەدەن، بە هێڵە گشتی و بنەماکانیانەوە ڕاڤە دەکات و دەیانخاتە پێش چاوی مرۆڤایەتی.

خۆ ئەو بابەتەش کە ئێمە دەمانەوێت بە وردی هەڵوێستەی لەسەر بکەین، هەر ئەمەیە. ئەو لە خۆیەوە هیچی نەدەوت، بەڵکو گشت قسە و ئاخاوتنێکی، وەحیی پەروەردگار بوو. جا کە هەواڵدەر و ئاگادارکەر خوای گەورە بوو، ئەوا نەك تەنها سەرداری هەردوو جیهان، بەڵکو تەنانەت کۆمەڵە کەسانێکی پێگەیشتووش لە نێو ئوممەتدا، لە شێوەی کەرامەتدا ئاگاداری غەیب دەکرێنەوە. ئەوەتا ڕەسوولی سەروەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: " لە نێو ئوممەتەکەمدا کۆمەڵێك "مُلهَمُون" هەن." [1] "مُلهَمُون"یش ئەو کەسانەن کە مەزهەر و بەهرەمەندی ئیلهامی خوایین.

حەزرەتی عومەریش(رَضِيَٱللَّهُعَنۡهُ) یەکێکە لەوانە. ئەوەتا کاتێك لە مزگەوت وتاری هەینی دەدا، بینی وا سوپای موسوڵمانان کە لە دووری چەندین ڕۆژە

---

١ - القرطبي، الجامع لأحكام القران ١٧٤/١٣ ـ إبن حجر، مقدمة الفتح الباري ١٠٣ ـ الفتح الباري ٥١٦/٦ ـ الغزالي، إحياء علوم الدين ٢٤/٣ ـ هەروەها بڕوانە: البخاري، الأنبياء ٥٤ ـ مسلم، فضائل الصحابة ٢٣.

ڕێ دەجەنگان، خەریکە لەلایەن سوپای دوژمنەوە لەبەری شاخەکەوە گەمارۆ دەدرێن. بۆیە لەبەرامبەر ئەم دیمەنەدا وتارەکەی بڕی و لەسەر مینبەرەوە سێ جار هاواری کردە "سارییە" کە سەرکردەی سوپاکە بوو: " ئەی سارییە، بۆ لای شاخەکە." حەزرەتی سارییەش بە بیستنی ئەم دەنگە، ئاگاداری بۆسەکە بوویەوە و گەمارۆکەی پوچەڵ کردەوە.[1] لە لایەکی ترەوە چەندین زاتی وەلی وەك "موحیەددینی عەرەبی" و "مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی" و "ئیمامی ڕەببانی" و "موشتاق ئەفەندی" و سەدان ئەولیای تریش، چەندین هەواڵیان لە داهاتوو داوە و، ڕۆژگاریش ڕاستیی هەواڵەکانیانی دەرخستووە. هەموو ئەمانەش ڕادەی دڵ پەیوەستیی ئەو زاتانە بە ڕەسوولی نازدارەوە دووپات دەکەنەوە و، ڕایدەگەیەنن هەموو ئەو واریداتانەی بەهرەمەندی بوون لە "میشکاتی موحەممەدی"یەوە سەرچاوەی گرتووە. ئیتر دوای ئەمە، تێگەیشتن لەوەی کە ئەو زاتە ـ بە ئیزنی خوا ـ تا چ ئەندازەیەك کراوە بووە بە ڕووی غەیبدا، حەواڵەی ئیدراك و هزری خوێنەری ئازیز دەکەین.

جا ئەگەر ئەو کەسانەی پێغەمبەری خوا پێی گەیاندوون، ئا بەم جۆرە مەزهەری ئیلهام بن و دڵیان والا بێت بە ڕووی سروە ئیلاهییەکاندا و، تا ئەو ڕاددەیەش لە غەیب ئاگادار بکرێنەوە، بۆ دەبێ ئاگادار کردنەوەی سەرداری هەردوو جیهان ـ کە ئەگەر هەر خۆی بە تەنها بخرێتە تایەکی تەرازووەوە و سەرجەم ئوممەتەکەشی لە تاکەی تردا، ئەوا تاکەی پێغەمبەری خوا سەنگینتر دەبێت[2] ـ لە غەیب ـ وەك یەکێك لە موعجیزەکانی ـ بە دوور بزانرێت؟..

کتێبە بەناوبانگەکانی فەرموودە، نزیکەی سێ سەد موعجیزەی لەم جۆرەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باس دەکەن. بەشێکی زۆری ئەو هەواڵە

---

١ - أبو نعيم، دلائل النبوة ٥٧٩ ـ البيهقي، الأعتقاد ٣١٤.

٢ - أحمد إبن حنبل، المسند ٧٦/٢ ـ الدارمي، المقدمة ٣.

غەیبییانەش، وەك خۆی هاتوونەتە دی و، ئەوانی تریش چاوەڕوانی کاتی سەرهەڵدانیان دەکەن. ئێمە لێرەدا هەموو ئەو هەواڵانە ناهێنین، بەڵکو تەنها چەند نموونەیەك دەهێنینەوە، تاوەکو بیرۆکەیەکمان لەمەڕ بابەتەکە بداتێ. ئەو نموونانەش پۆلێن دەکەین بۆ سێ کۆمەڵەی سەرەکی:

**یەکەم:** ئەو هەواڵە غەیبییانەی تایبەتن بە سەردەمی خۆیەوە.

**دووهەم:** ئەو فەرمایشتانەی سەبارەت بە داهاتووی دوور و نزیکەوە فەرموونی.

**سێهەم:** ئەو دەربڕینە پڕ موعجیزاتانەی کە بە شێوازی "سەهلی مومتەنیع"(السهل الممتنع)[1] فەرموونی و، لەپاش پێشکەوتنی زانستەکان حەقیقەتەکانیان ڕوون بووەتەوە.

---

١- بۆ زانیاری زیاتر تکایە بڕواننە: کتێبی وتەکان، وتەی بیست و پێنجەم، ل ٥٧١ - ٥٧٢.

# هەواڵە غەیببیەکان

## یەکەم

## ئەو هەواڵە غەیبییانەی تایبەتن بە سەردەمی خۆیەوە

١ـ کتێبەکانی فەرموودە، لە پێشی هەمووشیانەوە صەحیحی بوخاری و موسلیم ئەم ڕووداوەی خوارەوە دەگێڕنەوە:

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا چووە سەر مینبەر.. ڕوانینی ئاڕاستەی جیهانە غەیبیەکان کرد و لەنێوەندی تەجەللییاتە جەلالییەکانیدا ـ کە لە شێوەی تووڕەیدا خۆیان دەنواند ـ دەستە دەستە واریداتی بەسەر ئامادەبوواندا پەخش دەکرد. لەو نێوەندەدا فەرمووی: " ئەمڕۆ چیتان دەوێت بپرسن." ئیتر ئامادەبووانی کۆڕەکە پرسیاریان دەکرد و ئەویش وەڵامی دەدانەوە. لەو کاتەدا گەنجێك هەستایە سەرپێ و، وتی: " ئەی پێغەمبەری خوا باوکی من کێیە؟ " پێدەچێت ناوەناوە قسەوقسەلۆك لەبارەی باوکییەوە کرابێت و، ئەو گەنجەش پێیان نارەحەت بووبێت. جا ئەو ڕۆژە هەلێکی دەست کەوتبوو و، لەبارەی باوکییەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا دەکرد کە ـ بە ئیزنی خوا ـ چاوانی بە ڕووی غەیبدا کراوە بوون. سەروەرمان وەڵامی دایەوە و، فەرمووی: " باوکی تۆ "حوزافەیە"." ئیدی گەنجەکە ئاسوودە بوو. چونکە ئەو وەڵامەی وەریگرتبوو، وەڵامێکی دڵخۆشکەر بوو. ئیتر لەمەودوا ئەویش ـ بە شێوەیەك کە هیچ گومان و دوودڵییەك توخنی نەکەوێت ـ دەدرایە پاڵ باوکێك و بە "عبداللە ی کوڕی حوزافەی سەهمی" بانگ دەکرا.

ئا لەو کاتەدا کـە هەرکەسـە و پرسـیاری شـتێکی دەکـرد، یـەکێك لـە ئامادەبووان کە زۆر چاك لەو حاڵەتە ڕۆحییەی پێغەمبەری خوا تێگەیشتبوو، بەڵێ، کەڵە عومەر(ﷺ) یەکراست لەجێی خۆی راپەڕی و، فەرمووی: رَضِـينَا بِاللّهِ رَبّاً وَبِالْإِسْـلاَمِ دِينـاً وَبِمُحَمَّـدٍ نَبِيّـاً. " رازی بـووین الله پـەروەردگارمان و، ئیسلام دینمان و، حەزرەتی موحەممەدیش پێغەمبەرمان بێت." ئەم وتە ناسك و پڕ واتایانـەی حـەزرەتی عومـەر، دەروازەی بـەڕووی ئـەو سـروە دڵنیـایی بەخشانەدا ئاوەڵا کرد، کە لە ناخی پێغەمبەری خوادا شنەیان دەهات. ئـیتر تەجەللییاتە جەلالییەکان، شوێنیان بۆ شەماڵەکانی ئونس بەجێهێشت.[1]

ئـەم ڕووداوە، لـە حـزووری ئـەو صـەحابیانەدا ڕوویـدا کـە مزگـەوتیان پڕکردبوو. هەر هەموویان تەصدیقی فەرمایشتەکانی پێغەمبەریان دەکـرد و، وەك بڵێی بە بێدەنگ بوونیان دەیانوت: " ڕاست دەفەرموویت"

٢ ـ ئیمـامی موسـلیم دەگێڕێتـەوە: ڕاویـی حەدیسـەکەش حـەزرەتی عومەرە(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) .. دەفەرموێت: " لە غەزای بەدردا بووین. پێغەمبەر(ﷺ) ستراتیژی جەنگەکەی بەتەواوەتی دارشتبوو و مەیدانی جەنگەکە دەگەڕا. لـە پڕێکدا ڕوانینەکانی بڕییە ئەودیو پەردەکانی غەیب و، نیگاکانیشـی ڕوو لـە ئاسۆکانی داهاتوو، بە دەستی موبارەکی ئاماژەی بۆ چەند شـوێنێك کـرد و، فەرمووی:'سبەینێ، ئێرە جێگەی کوژرانی ئەبوو جەهلە، ئێرەش هی عوتبـە و، ئەمەش جێی شەیبەیە و وەلیدیش لێرەدا دەگەوزێت...' وە چەندەها ناوی تریشی ژمارد." لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە، حەزرەتی عومـەر سـوێند

---

١ - البخاري، العلم ٢٩، الدعوات ٣٥، الفتن ١٥، الأعتصام ٣، مسلم، الصيام ١٩٧، الفضائل ١٣٦،١٣٧.

دەخوات و، دەڵێت: " پێغەمبەری خوا ئاماژەی بۆ چ شوێنێك کردبوو، ئاوها هەموویانمان لەو شوێنانەدا بە مردوویی دیتەوە." [1]

بەڵێ، ئەو مرۆڤانەی کە تا لە ژیاندا بوون، بە زمانیان تەصدیقی پێغەمبەریان نەدەکرد، وا ئێستا بە جەستەی مردوویان، شایەتی دەدەن لەسەر صیدق و ڕاستگۆیی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا هەواڵی ئەدا و، هەواڵەکانیشی بێ ئەوەی سانتیمێك بترازێن، وەك خۆیان دەهاتنە دی.

٣- ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدەکەیدا ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە:

جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مزگەوت لەنێو هاوەڵاندا دانیشتبوو، لە دەرفەتێکدا فەرمووی: " پاش کەمێکی تر مرۆڤێکی نوورانی لەو دەرگایەوە دێتە ژوورەوە. ئەو کابرایە لە چاکترین مرۆڤەکانی یەمەنە و ناوچەوانی جێدەستی فریشتەی پێوەیە." پاش ماوەیەك کابرایەك هەر بەوشێوەی کە پێغەمبەری خوا وەسفی کردبوو هاتە ژوورەوە. لە حزووریدا چۆکی دادا و، موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. ئەو مرۆڤە سیما پاك و ڕوخسار درەوشاوەیەش، کە نموونەی ئەدەب و ویقار بوو، جگە لە "جەریری کوڕی عەبدیللای بەجەلی" کەسی تر نەبوو. [2]

٤- ئیمامی بەیهەقی لە"دلائل النبوة" کەیدا ئەم ڕووداوەی خوارەوە دەگێڕێتەوە: ئەبوو سوفیان لە کاتی فەتحی مەککەدا موسوڵمان بووبوو، بەڵام هێشتا بەتەواوی ئیمان لەدڵیدا جێگیر نەبووبوو. جارێکیان کە پێغەمبەری خوا تەوافی کەعبەی دەکرد، ئەویش لەو ناوەدا دەسووڕایەوە. لەو کاتەدا

---

١- مسلم، الجنة ٧٦ ـ النسائي، الجنائز ١١٧.
٢- أحمد إبن حنبل، المسند ٣٥٩/٤- ٣٦٠، ٣٦٤.

ئەوەی بەخەیاڵدا هات کە: " داخۆ دەبێت چۆن بێت گەر سەرلەنوێ سوپا رێك بخەمەوە و بەرەنگاری ئا ئەمە ببمەوە؟ " رێك لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە لای و، بە ئەسپایی ئەم قسانەی دا بەگوێیدا: " دیسانەوە شکست خواردوومان دەکردیت." ئیدی ئەبوو سوفیان لە مەسەلەکە حاڵی بوو. ئەو ئیمانە لەرزۆکەی تا ئەو ساتەوەختە هەیبوو، لە پڕێکدا جێگیربوو.. ئیتر لە شوێنی خۆی ئۆقرەی نەدەگرت و، هەر دەیوت: " داوای تۆبە و لێخۆشبوون دەکەم لە خوای گەورە." [1]

باشە دەبێ کێ هەواڵی ئەم خورپە ئانییەی دڵی ئەبوو سوفیانی بە پێغەمبەری خوا گەیاندبێت؟ ئەبوو سوفیان بەم هەڵوێستەی دەریدەخست کە حەزرەتی موحەممەد(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) رەوانەکراوی پەروەردگارە و ڕاستبێژە لە گوفتارەکانیدا...

٥ـ کتێبە بەناوبانگەکانی فەرموودە ئەم ڕووداوەی خوارەوەمان بۆ دەگێڕنەوە: عومەیری کوڕی وەهەب ـ کە بە "پیاوە شەیتانەکە"ی سەردەمی جاهیلیی ناسرابوو ـ [2] لەگەڵ "صەفوانی کوڕی ئومەییە"دا ڕێککەوتن. بەگوێرەی ئەم ڕێککەوتنە، عومەیری کوڕی وەهەب بەبیانووی کوڕەکەیەوە کە لەنێو دیلەکانی بەدردا بوو، دەچووە مەدینە و بە شمشێرە ژەهراوییەکەی پێغەمبەری خوای دەکوشت. لە بەرامبەر ئەمەشدا، صەفوان قەرزەکانی عومەیری دەبژارد و هەر شتێکیشی بەسەردا بهاتایە، سەرپەرشتی کردنی خێزانەکەیی دەگرتە ئەستۆ.

---

١- البيهقي، دلائل النبوة ١٠٢/٥ ـ ابن كثير، البداية و النهاية ٣٤٨/٤.
٢ - إبن هشام، السيرة النبوية ٢١٢/٣ ـ إبن الأثير، أسود الغابة ٣٠٠/٤.

عومەیر شمشێرەکەی تیژ کرد و بەرەو ئامانجەکەی کەوتەڕێ. کاتێک گەیشتە مەدینە، بردیان بۆ مزگەوتەکەی رسول الله(ﷺ). عومەیر کەسێک نەبوو متمانەی پێ بکرێت، هەربۆیە ئەصحاب نەیاندەویست بە تەنها لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەجێی بهێڵن. هەر هەموویان وەك قەڵایەك لە گۆشت و خوێن، بەدەوری پێغەمبەری خوادا ڕیز ببوون و چاودێریان دەکرد. ئینجا پێغەمبەری خوا هۆی هاتنەکەیی پرسی. ئەویش لە وەڵامدا کۆڵێك درۆی ڕێکخست. بەڵام پێغەمبەری خوا باوەڕی بە هیچ کامیان نەکرد. لە کۆتاییدا سەروەری هەردوو جیهان پێی وت: " مادام تۆ ڕاستیی نادرکێنی، ئەوا با من پێت بڵێم." ئینجا پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) باسی ئەوەی بۆ کرد کە چۆن لە مەککە لەگەڵ صەفوان ڕێککەوتوون لەسەر کوشتنی پێغەمبەر و، چ گفتوگۆیەك لەنێوانیاندا ڕووی داوە، بە دوور و درێژیی هەمووی بۆ گێڕایەوە. عومەیر بە بیستنی ئەمانە کاس و وڕمابوو. بۆیە بێ سێ و دوو، دەستی موبارەکی پێغەمبەری گوشی و موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. حەزرەتی عومەیر دواتر لە پێناوی سەرخستنی ئیسلامدا، هێندە کۆششی کرد، تا ئەوەی لە ڕێگەی ئەوەوە چەندەها کەس بە ئیسلام شادبوون.[١]

پێغەمبەری خوا لە کوێوە گوێبیستی ئەم گفتوگۆیەی نێوان عومەیر و صەفوان بوو؟

لەگەڵ بوونی ئەو دوورییە لە نێوانیاندا، کێ ئەم هەواڵەی بە سەروەرمان گەیاند؟

جا با باوەڕداران و ئەوانەش کە باوەڕیان نییە، لە هەوڵی حونجەکردنی ئەم ڕووداوە و هاوشێوەکانیدا بن و، ئێمەش بچینە سەر بڕگەی دواتر...

---

١- الطبراني، المعجم الكبير ١٧/٥٦-٦٢ ـ إبن الأثير، أسود الغابة ٤/٣٠٠-٣٠١.

## دووهەم

## ئەو هەوالانەی پەیوەندییان بە داهاتووەوە هەیە

### أ- لەسەردەمێکی نزیکدا

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە: حەزرەتی ئوسامە، کوڕی "زەیدی کوڕی حاریثە"یە و خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە. هەرکات حەزرەتی حەسەن یان حوسێنی لەسەر ڕانێکی دابنایە، حەزرەتی ئوسامەشی لەسەر ڕانەکەی تری دادەنا. جارێکیان ڕووی کردە هەرسێکیان و، بەم جۆرە دوعای کرد: "خودایە ڕەحم بەمانە بکە، چونکە منیش ڕەحمیان پێدەکەم." [1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی موبارەکیدا ئوسامەی کردە سەرکردەی ئەو سوپایەی کە ئامادەی کردبوو بۆ جەنگان لەگەڵ ڕۆمەکان و، ئەرکی تەمێ کردنی دوژمنانی خوای لەو ناوچانەدا پێ سپاردبوو، کە پێش چەندین ساڵ باوکی تیادا شەهید کرابوو.[2] بەڵام کە ئوسامە بینی تەندروستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرەو خراپی دەچێ، سوپاکەی ڕاگرت و، تا وەفاتی سەروەرمان نەیخستە جووڵە.[3]

ئەم ئوسامەیە دەڵێت: "ڕۆژێکیان لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم. چووبووە سەر بانیژەی یەکێك لە خانووە بەرزەکانی مەدینە و، تەماشای دەوروبەری دەکرد. لەو بەینەدا فەرمووی:

---

١- البخاري، الادب ٢٢ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢٠٥/٥

٢- البخاري، المغازي ٨٧ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ٣٠٤/٦- ٣٠٥.

٣- إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٤٩/٢ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ٣٠٤/٦- ٣٠٥.

إِنِّـي لأَرَى مَوَاقِـعَ الْفِـتَنِ خِـلاَلَ بُيُـوتِكُمْ كَمَوَاقِـعِ الْقَطْـرِ. " ئێستا لەنێو ماڵەكانتاندا هەروەك باران بارین، داباریني فیتنەكان دەبینم." [1]

پێغەمبەری خوا ئەمەی وت و لێمان جیابووەوە.. لەپاش ئەو، كووچە و كۆلانەكان لەتاو تەوژمی فیتنەكان دەیاننالاند. بەڵێ، حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عوسمان و حەزرەتی عەلی(ﷺ) وەك قوربانیی ئەو فیتنانە شەهید كران. هەروەك بڵێی فیتنەكانیش بە زمانی بەلاّ و موسیبەتەكانیان، بە پێغەمبەری خوایان دەوت: " صَدَقْتَ"...

## ١ ـ فیتنەكان

حەزرەتی عومەر (ﷺ) بەدرێژایی ژیانی لە سەرهەڵدانی ئەم فیتنانە دەترسا. ڕۆژێكیان كە لەناو كۆڕێكی هاوەڵاندا لە مزگەوت دانیشتبوو، پرسی: " كەس هەیە لەناوتاندا دەنگوباسی ئەو فیتنانە بزانێت كە پێغەمبەری خوا هەواڵی سەرهەڵدانی دابوون؟ " هاوەڵی بەڕێز حوزەیفە هاتە وەلاّم: " بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران من دەیزانم." لەبەرامبەر ئەمەدا حەزرەتی عومەر فەرمووی: " تۆ كەسێكی بوێر و چاونەترسی، ئادەی بۆمان باس بكە." ئەویش فەرمووی: " فیتنە و بەلاّی مرۆڤ لە كەسوكار و سامان و نەفس و منداڵ و دراوسێیدایە، بەلاّم نوێژ و ڕۆژوو و صەدەقە و فەرمانكردن بە چاكە و ڕێگریكردن لە خراپە، دەبنە كەفارەتی ئەو بەلاّیانە و دەیانڕەوێننەوە." حەزرەتی عومەر فەرمووی: " نەخێر، من ئەمانە ناپرسم، بەڵكو مەبەستم لەو فیتنانەیە كەوەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدەن." ئینجا حەزرەتی حوزەیفە فەرمووی: " ئەی ئەمیری ئیمانداران، جا تۆ چیت داوە لەوانە، لەنێوان تۆ و

---

١ - البخاری، فضائل المدینة ٨ ـ مسلم، الفتن ٩.

ئەو فیتنانەدا دەرگایەکی داخراو هەیە.“ لە پاشان حەزرەتی عومەر پرسی: ” ئایا دەرگاکە دەکرێتەوە یان دەشکێنرێ؟ “ هەر کە حوزەیفە وتی" دەشکێنرێ"، حەزرەتی عومەر ڕاچڵەکی و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە ئەم چەند وشەیەی لەزار هاتەدەر: ” کەوابێ ئەو دەرگایە هەرگیز جارێکی تر داناخرێتەوە.“

جا کە دواتر هاوەڵان لە حەزرەتی حوزەیفەیان پرسی: ” داخۆ حەزرەتی عومەر(ﷺ) دەیزانی ئەو دەرگایە خۆیەتی؟ “ لەوەڵامدا پێی وتن: ” هەروەك چۆن دەیزانی لە دوای شەو ڕۆژ دێت، ئاواش دەیزانی کە مەبەست لەو دەرگایە خۆیەتی.“ [1]

بەڵێ، باش دەیزانی کە ئەو بڕوات، ئەو دەرگا داخراوانەی تایبەتن بە یەکڕیزیی ئوممەتی موحەممەدەوە، دەکرێنەوە و، فیتنە و فەساد لەگەڵ خۆیدا دەیبات و، لەنێو ئوممەتیشدا بیروڕای هەمەچەشن و ڕەوتی جۆراوجۆر سەرهەڵدەدات...

حەزرەتی عومەر ئەمانەی دەزانی. چونکە هەواڵدەری ئەم ڕووداوانە، زاتی صادق و مەصدوق، فەخری کائینات، حەزرەتی موحەممەد موستەفا بوو(ﷺ).

کە ڕۆژیشی هات، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا هەواڵی دابوو، هەروا ڕوویدا. حەزرەتی عومەر لەلایەن فارسێکی خائینەوە درایە بەر خەنجەر. هەر لەو ڕۆژەدا کە حەزرەتی عومەر درایە بەر خەنجەر، زامێکی قووڵ و برینێکی بەسۆش لە جەرگی یەکڕیزیی موسوڵمانانیدا دروست بوو. بەرەی نەیار زۆر بەچاکی ئامانجەکەی هەڵبژاردبوو و، تیرە بێ ویژدانەکەشی ڕێك و ڕاست

---

١- البخاري، مواقت الصلاة ٤ ـ الصوم ٣ ـ مسلم، الفتن ٢٦- ٢٧

ئامانجەکەی پێکابوو. بەڵێ، بە وەفاتی ئەو، فیتنە و ئاژاوەکان وەك بلێسی بوونە لافاو و جیهانی ئیسلامییان ڕامالّی. بێگومان ئەمە لەلایەکەوە کۆست و پەژارەیەکی گەورە بوو، بەلاّم لەلایەکی ترەوە، بەڵگەیەکی هێندە بەهێز بوو، هەروەك ئەوەی بە زمانی ڕووداوەکان لە ئەستێرەکانی ئاسمان: "لا اله الا الله محمد رسول الله" بنوسرێت...

## ٢ ـ سەرکەوتن

لە سونەنی ئەبو داوود و صەحیحی بوخاریدا ئەم بەسەرهاتەمان بەرچاو دەکەوێت، کە خەبابی کوڕی ئەرەت (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە. پوختەی بەسەرهاتەکەش ئەمەیە:

" لە سەردەمێکی پڕ ئازار و ناڕەحەتیدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوو و، سەرپۆشەکەی دابوو بەسەریدا. کێ دەزانێ ئەمجارەشیان تووشی چ ئازار و سووکایەتییەك بووبێت؟! ئەو سەردەمە بوو کە هەموو باو و نەریتەکانی جاهیلی، وەك چەك لە دژی موسوڵمانان بەکاردەهێنران. هێشتا لە بەندی کۆیلایەتی ئازاد نەکرابووم. خاوەنەکەم و گەورەکانی تری مەککە بەجۆرێ ئازاریان دەدام، کە چیتر توانای بەرگەگرتنم نەمابوو. جا کە بینیم پێغەمبەری خوا(عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) تەنهایە، یەکسەر خۆم گەیاندێ و عەرزم کرد: 'ئەی پێغەمبەری خوا, ئایا لە پەروەردگار ناپاڕێیتەوە تا کۆمەکی و سەرکەوتنمان بەهاناوە بنێرێت؟' ـ وای دەزانی رسول الله خێرا دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەکەوێتە دوعا کردن.. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو چاوەڕوانی دەکرد دوعای خراپیشیان لێبکات ـ بەلاّم پێغەمبەری خوا دوور لەم چاوەڕوانییانە، ئەمانەی خوارەوەی فەرموو:

" سوێند بە خوا، ئوممەتەکانی پێش ئێوە ئەشکەنجەی زۆر سەختتریان چەشتووە. هەیانبوو دەخرایە ناو چاڵەوە و بە مشار دەکرا بەدوو کەرتەوە، کەچی هێشتا لە دینەکەی پاشگەز نەدەبووەوە. یاخود هی وایان هەبوو گۆشت و ئێسقانی لەیەکتر جیادەکرانەوە و، تۆسقاڵێك لەرزە نەدەکەوتە ئیمانەکەیەوە. وەڵڵاهی خوای گەورە ئەم کارە تەواو دەکات و بەئەنجامی دەگەیەنێت، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن. ڕۆژێك دادێت سوار لە "صەنعا" وە دەڕوات بۆ "حەزرەمەوت" و جگە لە ترسی ئاژەڵە دڕندەکان، ترسی هیچ شتێکی تری نابێت." [1]

هەروەها حەزرەتی "عەدیی کوڕی حاتەم" کە فەرموودەیەکی هاوشێوەی ئەمەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕیوایەت کردووە، باس لەوە دەکات بە چاوی خۆی ئەو ڕووداوانەی دیووە کە پێغەمبەری خوا هەواڵی ڕوودانی دابوون. [2]

## ٣- " تۆ یەکەم کەسی کە پێم دەگەیت "

پێغەمبەر(ﷺ) لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ئەو نەخۆشییەیدا، کە بووە هۆی کۆچکردنی بۆ خانەی هەمیشەیی، حەزرەتی فاتیمەی ـ ئەو فاتیمەیەی کە بێ هاوتابوو لە ناسکیدا و، لە هەڵسوکەوت و، نیگا قووڵەکانیدا هەر دەتوت خۆیەتی ـ بانگ کرد و چەند شتێکی چرپاند بە گوێدا. حەزرەتی فاتیمە بە بیستنی ئەو وتانە، گریە و فیغانێکی وای کرد، هەمووانی ڕاچڵەکاند. لەپاش کەمێك، دیسانەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند شتێکی تری بەگوێدا

---

١ - البخاري، المناقب ٢٥ ـ مناقب الأنصار ٢٩ ـ الأكراه ١ ـ أبو داود، الجهاد ٩٧.

٢ - البخاري، المناقب ٢٥ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢٥٧/٤.

چرپاندەوە. ئەمجارەیان هێندە شادی گرتی، هەرکەسێ بیبینیایە وایدەزانی لە هەموو دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگهێشت کراوە.. لە ڕاستیدا بەلای ئەوەوە هەرواش بوو. بەڵێ، ئا بەو شێوەیە دڵخۆش و شادمان بوو.

ئەم ڕووداوە لە چاوی دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە(ﷺ) بزر نەبوو. پاش کەمێك هۆکاری ئەو ڕووداوەی لێ پرسی، بەڵام حەزرەتی فاتیمە پێی وت: " ئەمە ڕازێکی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە." و هیچ شتێکی تری نەدرکاند. بەڵام لە دوای وەفاتی فەخری عالەم(ﷺ) کاتێك حەزرەتی عائیشە جارێکی تر لێی پرسییەوە، حەزرەتی فاتیمە بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: " لە جاری یەکەمدا، پێغەمبەری خوا هەواڵی وەفاتی خۆیی پێدام، بۆیە گریام. ( بەڵێ، وەفاتی نەبی بە جۆرێك خستییە گریان و، نوقمی فیغانی کرد، ئەوەتا چوارینەکانی ئەو ڕۆژەی بەسە بۆ ئەوەی دنیا بهێنێتە گریان:

مَاذَا عَلَيَّ مَنْ شَمَّ تُـرْبَةَ أَحْمَدَا    أَلاَ يَشُمُّ مَدَى الزَّمَـانِ غَوَالِيَا
صُبَّتْ عَلَيَّ مَصَائِبُ لَوْ أَنَّهَا    صُبَّتْ عَلَى الأَيَّامِ عُدْنَ لَيَالِيَا[1]

" کەسێك بۆنی خۆڵی مەزارەکەی حەزرەتی موحەممەدی کردبێ، چ گەرەکیەتی بەدوای بۆنی تردا بگەڕێ؟ بەڵا و کارەساتێکی وام بەسەردا ڕژاوە، ئەگەر بەسەر ڕۆژگارەکاندا بڕژانایە، هەموویان دەبوونە شەوگار."

لە جاری دووەمیشدا، مژدەی ئەوەی پێدام کە من یەکەم کەس دەبم لە ناو خێزانەکەیدا، کە پێی دەگەم.. ئیتر لەبەرئەوە دڵخۆش بووم."[2]

لەدوای شەش مانگ، ئەویش بە باوکی شادبووەوە.. ئەم وەفاتەی حەزرەتی فاتیمەش تەصدیقی پێغەمبەری خوا دەکات و، دەڵێت: " صَدَقْتَ "

---

١- الذهبي، سير أعلام النبلاء ٢/١٣٤.
٢- البخاري، المغازي ٨٣ ـ مسلم، فضائل الصحابة ٩٨-٩٩.

## ٤ـ صولح و ئاشتەوایی

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا، کە لە لایەن زۆرینەی ئەوانـەی فـەرموودەیان گێڕاوەتەوە ڕیوایەت کراوە، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە وتاردا ئامـاژە بۆ حەزرەتی حەسەن دەکات و، دەفەرموێت:

إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ.[1]

" ئەم کوڕەم سـەییدە، بەشـکوم ڕۆژێ لـە ڕۆژان خـوای گـەورە بـەهۆی ئەمەوە، ئاوبڕی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵی مەزن لە موسوڵمانان."

بەڵێ، ئەو کەریی کوڕی کەریمە. نەوەی پێغەمبـەری خوایـە.. گـەورە و پایەدارە. ڕۆژێك دێت تەنها لەبەر ئەوەی جـودایی و نـاکۆکی نەکەوێتـە نـاو ئوممەتەوە، دەستبەرداری ئەو خیلافەت و سەڵتەنەتە دەبێت کە پێی سپێرراوە و، بەم جۆرەش دەیسەلمێنێت کە چۆن سەییدێکی کوڕی سەییدە. بیست و پێنج یان سی ساڵێك تێپەڕ نەبووبوو بەسەر قسەکانی پێغەمبەردا، کە یەك بە یەك هاتنەدی.

لە دوای حەزرەتی عەلی، ئەمەوییەکان حەزرەتی حەسەنیان لەبەرامبـەر خۆیاندا دیتەوە. بەڵام حەزرەتی حەسەن(ﷺ) پیاوی ئاشـتی و ئـارامی بـوو، بۆیە بە وازهێنانی لە سەرجەم مافەکانی خۆی، ئاشتەوایی خستە نێـوان ئـەو دوو سوپایەی موسوڵمانانەوە کە لە لێواری بەیەکدا پژانـدا بـوون. ئـیتر بـەم

---

١ -البخاري، الصلح ٩ ـ الترمذي، المناقب ٣٠.

جۆره ـ ئەگەر بە شێوەیەکی کاتیش بێت ـ توانی پێشگیریی لـە فیتنەیـەکی ترسناك بکات.[1] شاعیر چەند جوان وتویەتی:

كَرِيمُ بْنُ كَرِيمِ بْنِ كَرِيمِ          وَجَدُّهُ خَيْرُ الْأَنَامِ

" ئەو(حەسەن) کەریمی کوڕی کەریمە. جا چۆن وا نەبێت، لە کاتێکـدا کـە باپیری باشترینی مرۆڤەکانە و مایەی شانازی بوونەوەرانە."

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ئەم ڕووداوەی دا، حەزرەتی حەسەن هێشتا منداڵێکی بچکۆلانە بوو. تەنانەت لەوانەیـە هـەر تێشنەگەیشـتبێت لـەوەی پێغەمبەری خوا ئاماژە بۆ چی دەکات. واتە، ئەو لەبەر ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا وای فـەرمووە، بـەم کـارە هەڵنەسـاوە، بـەڵکو پێغەمبـەری خوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) بۆیە ئەوەی فەرمووە، چونکە دەیزانی حەزرەتی حەسـەن وا دەکات. بەڵێ، حەزرەتی حەسەنیش تەصدیقی باپیری دەکـات و، چـەندین ساڵ دواتر پێی دەوت: " صَدَقْتَ "

## ٥ـ سەدەیەکی تەواو دەژی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەسـتی خسـتە سـەر سـەری "عەبـدوڵلای کـوڕی بوسر"(رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) و، فەرمووی: " ئەم منداڵە سـەدەیەکی تـەواو دەژی، ئـەو باڵووکانەی ڕوخساریشی لادەچن." دەگێڕنەوە ئەو زاتە سەد ساڵی ڕێك ژیـا و باڵووکەکانی ڕوخساریشی لاچوون.[2]

---

١- إبن كثير، البداية و النهاية ٤٥/٨ ـ إبن حجر، الأصابة ٧٢/٢.
٢- الطبراني، مسند الشاميين ١٧/٢ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ١٨٩/٤ ـ البزار، المسند ٤٣١/٨-٤٣٢ ـ حاكم، المستدرك ٥٤٥/٤.

جا هەروەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) بەپێی نهێنی ئایەتی: ﴿ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴾ (الضحى:٤) هەر ساتێکی ژیانی لەچاو ساتەکانی پێشووتریدا، بەرزتر دەبووەوە و، پلەیەکی تری کەماڵی دەبڕی و، هەردەم حاڵی پێشوتری بە بەراورد لەگەڵ حاڵی دواتریدا، بە کەم دەبینی و، بەم هۆیەشەوە لە ڕۆژێکدا سەد جار "إستغفار"ی دەکرد،[1] بەو شێوەیەش ئوممەتەکەی ڕۆژ دوای ڕۆژ هەنگاوێك زیاتر لە ناسین و تێگەیشتنی پێغەمبەرەکەیاندا بەرەوپێش دەچن و، لەبەرامبەر هاتنەدیی ئەو هەواڵانەی سەبارەت بە داهاتوو دابوونی، ئیمانیان تۆزێك زیاتر دەبێت و، ڕوو لە پێغەمبەرە نازدارەکەیان دەڵێن: " بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت."

## ب ـ داهاتووی نزیك

ئێستاش دەمانەوێت کەمێك لەسەر ئەو نموونانە بوەستین، کە لە ڕووی وادەی زەمەنییەوە لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزمانەوە(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوورن و، زیاتر لەو سەردەمانەوە نزیکن کە ئێمەی تێدا دەژین. تەنانەت هەندێکیشیان ڕوویان لەم سەدەیەی خۆمانە. کۆمەڵێکی تریشیان چاوەڕوان دەکرێت لە سەدەکانی دواتردا بێنەدی. فەرموون ئێوە و چەپکێك لەو نموونانە:

## ١ ـ هەواڵەکانی خەندەق

زۆربەی کتێبەکانی سیرە و فەرموودە، ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕنەوە: " موسوڵمانان سەرگەرمی هەڵکەندنی خەندەق بوون بە دەوری

١ - البخاري، الدعوات ٣ ـ مسلم، الذكر ٤١-٤٢.

مەدینەدا. لەو کاتەدا تاشە بەردێکی زەبەلاح هاتە ڕێمان، کە بە هیچ جۆرێك لەجێی خۆی نەدەجوولا. لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا، پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەگەڵماندا بەشداربوو. تەنانەت جارجارەش بۆ بەرزکردنەوەی هێزی مەعنەویمان، دەیفەرموو:

اَللّٰهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الْآخِرَةِ فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ [1]

"پەروەردگارا، جگە لە ژیانی ئاخیرەت، ژیانێکی تر نییە. دەسا لە ئەنصار و موهاجیرین خۆش ببە."

ئەصحابیش بەم وتانەی رسول الله دەکەوتنە جۆش و، لەبەرامبەرییەوە دەیانوت:

اَللّٰهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتِ الْأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا [2]

"پەروەردگارا، ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئێمە نەدەگەیشتینە هیدایەت، نە نوێژمان دەکرد و، نە زەکاتیشمان دەدا. دە کەوایە سەکینەت و ئارامی خۆتمان بەسەردا ببارێنە و، لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەشماندا لەگەڵ دوژمن ڕاگیر و دامەزراومان بکە."

ئەوان تەنانەت بچووکترین دەردی خۆشیان دەبردە لای پێغەمبەری خوا. بۆیە حاڵی ئەم تاشەبەردەشیان عەرز کرد. بەڕڕائی کوڕی عاذیبی ئەنصاری(ﷺ) دەڵێت:

---

١- البخاري، المغازي ٢٩ ـ مناقب الأنصار ٩ ـ مسلم، الجهاد ١٢٦- ١٢٩.
٢- البخاري، المغازي ٢٩ ـ مسلم، الجهاد ١٢٣- ١٢٥.

" سکالآی تاشە بەردەکەمان بردە لای پێغەمبەری خوا. ئەویش تەشریفی موبارەکی هێنا و،"بسم الله"ی لێ کرد و چەکووشێکی لێدا. بەم پیاکێشانە سێ یەکی بەردەکەی شکاند و، فەرمووی: " الله اکبر، کلیلەکانی شامم پێ دران. سوێند بەخوا، ئێستا کۆشکە سوورەکانیان دەبینم." پاشان چەکووشێکی تری لێ دا و سێ یەکی تری شکاند و، فەرمووی: " الله اکبر، کلیلەکانی فارسم پێ بەخشران. سوێند بەخوا، ئێستا کۆشکە سپییەکانی مەدائین دەبینم." پاشان چەکووشی سێهەمی لێدا و، باقی بەردەکەی ورد کرد و، فەرمووی: " الله اکبر، کلیلەکانی یەمەنم پێ بەخشران. سوێند بەخوا، ئێستا دەرگاکانی سەنعا لەبەر چاومن." [1]

ئەوە بوو چەند ساڵێك تێ پەڕی کە خوای گەورە بە شمشێری گەورە سەرکردەکانی وەك "سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص"و "خالیدی کوڕی وەلید"(ﷺ) فەتحی هەموو ئەو ناوچانەی بۆ موسوڵمانان ئاسان کرد و، کلیلەکانیشیان تەسلیم بە کەسایەتی مەعنەویی پێغەمبەری خوا کران. دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی تر بوو لەسەر ڕاستگۆیی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ). جا دەبوو هەر واشبووایە، چونکە ئەو بۆ نمایندەیی و پەیڕەوکردنی ڕاستڕەوی هاتبوو. تەنانەت ئەگەر ـ بە فەرزی مەحاڵ ـ ئەو شتانەی فەرمووبوونی "دەبێت" لەڕاستیدا نەشبوونایە، ئەوا خوای گەورە بەس بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەی بەدرۆ نەخاتەوە، ئەو شتانەی دەهێنایە بوون.

---

١ - أحمد إبن حنبل، المسند ٣٠٣/٤ ـ النسائي، السنن الكبرى ٢٦٩/٥ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ١١٦/٤.

جا چۆن وا نەبێت! لەکاتێکدا تەنانەت دەربارەی "بەرڕائی کوڕی مالیك" کە یەکێکە لەهاوەڵە ناودارەکان وتراوە: لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللّهِ لأبرَّهُ.[1] " سوێند لەسەر هەر شتێك بخوات، خوای گەورە ئەو سوێندەی بۆ بەجێ دێنێت." واتە ئەگەر حەزرەتی بەرڕاء سوێندی لەسەر هاتنەدیی شتێك بخواردایە، کە هاتنەدیشی مەحاڵ بووایە، خوای گەورە بۆی دەهێنایەدی. جا هەر لە ڕاستیشدا هاوەڵە بەڕێزەکان لە جەنگدا بەرڕائیان پێش دەخست و، وەك بڵێی دەیانویست سەرکەوتنی خۆیانی پێ مسۆگەر بکەن.[2] تۆ بڵێی خوای گەورە ئەم تایبەتمەندییە خەڵاتی یەکێك لە هاوەڵان بکات و بە پێغەمبەرەکەی خۆی نەبەخشێ؟ ئەوەندە هەیە پێغەمبەری خوا ڕووداوەکانی دەبینی، ئینجا باسی دەکردن. بەڵێ، خوای گەورە ئەوی ئاگادار دەکردەوە و، ئەویش ڕایدەگەیاند...

## ٢ ـ مزگێنی ئاسایش و دەوڵەمەندی

عەدی کوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە.(عەدی، کوڕی حاتەمی تائییە. پێشتر مەسیحی بوو. بەڵام بەردەوام لە گەڕاندا بوو تا پێغەمبەری خوای دۆزییەوە، ئەو زاتەی دۆزییەوە و گەیشت بە سەرفرازیی) ئەم صەحابییە بەڕێزە بەم شێوەیە دەدوێت: " ڕۆژێکیان لە حزووری پێغەمبەری خوادا باسی هەژاری و نەبوونی و، تاڵانکاری چەتەکان دەکرا. ئەویش فەرمووی: 'ڕۆژێك دێت، ئافرەت بە تەنها لە حیرەوە دەچێت بۆ کەعبە و جگە لە خوای گەورە لە هیچ شتێکی تر ناترسێ.'

---

١ - الترمذی، المناقب ٥٤. ( ئەو هاوەڵە بەڕێزەی لە فەرموودەکەدا ناوی هاتووە، "بەرڕائی کوڕی مالیکە ، کە برای حەزرەتی "ئەنەسی کوڕی مالیك"ە لە باوکەوە.")

٢ - حاکم، المستدرك ٣/٣٣١ ـ البیهقي، الشعب الأیمان ٣٣١/٧ ـ إبن حجر، الاصابة ٢٨١/١.

عەدی دەڵێت: کاتێکی گوێبیستی ئەمانە بووم، سەرسام مابووم. لە دڵی خۆمدا دەموت: جا تا ڕێگر و چەتەکانی هۆزی "طائی" مابن، شتی وا چۆن دەبێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو لەسەر فەرمایشتەکانی: 'ڕۆژێك دێت گەنجینەکانی کیسرا لە نێوانتاندا دابەش دەکرێت.' منیش پرسیم: ئەی پێغەمبەری خوا، مەبەستتان لە گەنجینەکانی کیسرای فارسە؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: 'بەڵێ، مەبەستم گەنجینەکانی کیسرای فارسە.' ئیتر ئەوەندەی تر واقم وڕما ـ چونکە کاتێ ئەم ئاخاوتنە ڕووی داوە، ئیمپراتۆریەتی فارس لە پڕفیزترین و پرشنگدارترین ڕۆژەکانی ژیانیدا بووە ـ پێغەمبەری خوا بەردەوام بوو: 'ڕۆژێك دێت، پیاو کەسێك نادۆزێتەوە زەکاتەکەی بداتێ.' عەدی دەڵێ: من بە چاوی خۆم دوانەکەی یەکەمم دیت، خوا یاربێ سێهەمیشیان دەبینم." [1]

عەدی، ئەم ماوەی سێهەمەی نەدەدی. بەڵام ڕۆژێك هات، کەسانێك ئەو ماوەیەشیان دی: لە سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەو ڕاستییەی کە پێغەمبەری خوا باسی کردبوو، هەروەك خۆی هاتەدی. [2] ئەو دەوڵەتە مەزنە، کە سی دەوڵەتی وەك تورکیای ئێستای لەخۆ گرتبوو، لە ڕووی دابەشکردنی داهاتەوە گەیشتبووە ئاستێك کە تاکە هەژارێکی تێدا نەدەبینرا. وا نازانم موبالەغەمان کردبێت ئەگەر بڵێین: " پێوەری گوزەرانی ئەمریکا و هەندێ لە وڵاتانی خۆرئاوا بەراورد بە پێوەری گوزەرانی هاوڵاتییان لەو سەردەمەدا، بەجۆرێك نزمترە کە هیچ بەراوردکردنێك هەڵناگرێت."

١- البخاري، المناقب ٢٥ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٢٥٧/٤.

٢- عبدالله بن عبدالحكم، سيرة عمر بن عبدالعزيز ١١٠ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ١٩٤/٦ ـ إبن حجر، الفتح الباري ٨٧/١٣.

ئەمە لەگەڵ ئەوەی لە دەوڵەتە دەوڵەمەندەکانی ئەمڕۆدا، دابەشکردنی داهات هێندە ناهاوسەنگە، لەپاڵ ئەوانەدا کە ژیانێکی زۆر خۆشگوزەرانیان هەیە، کەسانێکیش هەن کە لە نێو خۆڵ و خاشاکدا ژیان بەسەر دەبەن. کەچی لەو سەردەمەدا ئەم ناهاوسەنگییەش بەری لێ گیرابوو.

## ٣ ـ شەهیدبوونی عەممار

موسوڵمانان سەرگەرمی بونیاتنانی مزگەوتی نەبەوی بوون. هەریەکە و ئیشێکی دەکرد. هەیانبوو خشتی دروست دەکرد. هەیانبوو دەیگواستەوە و هی واشیان هەبوو دیواری دادەنا.. بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەنێو ئەوانەدا بوو کە کاریان دەکرد.. بەڵێ، ئەویش لەسەر پشتی خشتی دەگواستەوە. لە دەرفەتێکدا "عەممار" هاتە لای پێغەمبەر و لەسەر پشتیشی دوو خشتی هەڵگرتبوو.. وەك بیەوێت ناز بکات، وتی: " یا رسول الله، ئەها دوو دانەیان خستۆتە سەرشانم." پێغەمبەری خواش زەردەخەنەیەکی کرد و، بەدەم سڕینی تەپوتۆزی ڕوخسارییەوە، ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی پێ ڕاگەیاند کە ڕێك پاش سی ساڵ دواتر بەسەریدا دەهات: وَيْحَكَ! تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ. (یاخود: أَبْشِرْ! تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ.[1] " مژدە بێ عەممار، تاقمە یاخی بووەکە دەتکوژن." بەم شێوەیە، هەواڵی دایە و ئاگاداری کردەوە لەوەی کە لە لایەن ئەو پێڕە یاخی بووەوە دەکوژرێت، کە لە حەزرەتی عەلی هەڵدەگەڕێنەوە.[2]

بەڵێ، لە جەنگی "صففین" دا حەزرەتی عەممار، لە ڕیزەکانی سوپای حەزرەتی عەلیدا بوو، هەر لەو جەنگەشدا شەهید کرا. تەنانەت لایەنگرانی

---

١ - الترمذي، المناقب ٣٣٤.

٢ - إبن هشام، السيرة النبوية ٢٥/٣ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ٢١٧/٣.

حەزرەتی عەلی، ئەمەیان وەك بەڵگەیەك بۆ ناحەقیی لایەنی بەرامبەر دەهێنایەوە و، دەیانوت: " کەوابێ تاقمە یاخی بووەکە ئێوەن."[1] بەڵێ، ئەگەرچی لە صففیندا خوێنی حەزرەتی عەممار ڕژا، بەڵام هەر دڵۆپە خوێنێکی وەك ئەوە وابوو کە لە بەرامبەر پێغەمبەری خوادا بڵێت: " ڕاستت فەرمووە."

بەڵێ خوێنەری ئازیز، ئەگەر ئاگادارکردنەوەی خوای گەورە نەبێت، مرۆڤ چۆن دەتوانێ ئەم شتانە بزانێت؟ ئەوەتا لە فلیمە خەیاڵییەکانی ئەمڕۆدا دەبینین هەندێ پێشبینی و کەهانەت سەبارەت بە ڕووداوەکانی داهاتوو دەکرێن. لە ڕاستیدا ئەمە کارێکی هێندە سەختیش نییە، چونکە هەموو ئەو پێشبینییانە، چەندەها پێشەکی و سەرەتایان هەیە.. کەمێك لێهاتوویی لە پێکەوەنان و داڕشتنی ڕووداوەکان، بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەم جۆرە بابەتانەدا خەملاندن بکات. بەڵام لە هیچ کام لەو مەسەلانەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بە غەیبی هەواڵی لەبارەیانەوە داوە، تۆسقاڵێکیش لەو پێشەکی و سەرەتایانە بوونی نەبووە. بەم پێیە، لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نییە ــ ئەگەرچی زۆر بلیمەت و ژیریش بێت ـ کە دە یەکی ئەو هەواڵانە ڕابگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا لەبارەیانەوە دواوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم جۆرە بابەتانە، لەدەرەوەی سنوورەکانی عەقڵی ئێمەی ئادەمیدان.. بەواتایەکی تر، مومکین نییە بەبێ بینایی چاوی غەیب، وە یاخود بەبی کۆمەکی و پشتیوانی وەحی، ئەم مەسەلانە بزانرێن. کەوابێ، پێغەمبەری خوا لە خۆیەوە نا، بەڵکو بەهەواڵ پێدانی لەلایەن پەروەردگارەوە ئەمانەی دەزانی. ئیتر لەبەرئەمە فەرمایشتەکانی هەمیشە ڕاست دەردەچوون...

---

١ - إبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٧/٧.

## ٤ ـ تاقمێکی بێ دین بە ناوی دینەوە

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) غەنیمەتی دابەش دەکرد، کابرایەکی چاو بەقوولاچووی، تەوێڵ دەرپەڕیوی، ڕیش چڕی، کوڵم قوتی، سەر تاشراو، هاتە حزووری. لەوانەیە ئەم کەسە نوێنەرایەتی ئەو تاقمەی کردبێت کە لە دواتردا سەری هەڵدەدا. بێ ئەدەبانە ڕووی لە پێغەمبەری خوا کرد و، وتی: " ئەی موحەممەد، دابەش کردنەکەت دادپەروەرانە نەبوو، دادپەروەر بە! " بەڵێ، لەوانەیە موونافیق بووبێت، ئاخر تەنها مونافیق بوو کە دەیتوانی ئاوا و بەو شێوەیە قسە بکات. پێغەمبەری خوا لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا فەرمووی: وَمَنْ يَعْدِلْ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟ لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ. [1] " جا ئەگەر من دادپەروەرانە مامەڵە نەکەم، کێ دادپەروەرانە مامەڵە دەکات؟ ئەگەر من دادپەروەر نەبم، کەواتە خەسارەتمەند و ڕەنجەڕۆ بووم." جا ئەگەر هەر دوو پیتی "ت" ی ناو ڕستەکە بە شێوازی دوێنراو (کەسی دووەمی تاك) بخوێنینەوە، ئەوا ئەوکات واتاکەی بەم شێوەیە دەبێت: " ...ئەوا تۆ خەسارەتمەند و ڕەنجەڕۆ بوویت."

بەمە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕووندەکاتەوە: ئەگەر گەلێك پێغەمبەرەکەی دادگەر نەبێت، ئەوا ئەو گەلە لە کێوە دادگەریی فێردەبن؟ جێگەیەکیش دادپەروەری تیادا نەبێت، خەڵکەکەی مایەپووچ و خەسارەتمەندن. کەوابێ ئێوەش مایە پووچ و خەسارەتمەند دەبن. ئینجا ئەگەر من دادپەروەر نەبم، ئەوا من خەسارەتمەندم. بەڵام خۆ پەروەردگار منی وەك پێغەمبەر ناردووە، کەواتە من ڕەنج بەخەسار نیم.. کەوابێ من دادپەروەرم.

---

١ - البخاري، المناقب ٢٥، الأدب ٩٥، الأستطابة ٤ ـ مسلم، الزكاة ١٤٨.

حەزرەتی عومەر(ﷺ) بۆ تەمێ کردنی ئەو نادانە کە ئەدەبی قسەکردنی لە حزووری پێغەمبەری خوادا نەدەزانی، داوای مۆڵەتی کرد: " ئیزن بدەن تا لە گەردنی ئەو مونافیقە بدەم." بەڵام پێغەمبەری نازدار ئیزنی نەدا. پاشان لە زاری موبارەکییەوە سەبارەت بەغەیب ئەم وتانە هاتنەدەرەوە:

" لە داهاتوودا قەومێکی ڕوخسار ئەبڵەقی، چاو بەقووڵاچووی، لووت پان سەرهەڵدەدەن. کاتێك قورئان دەخوێنن، قورئان خوێندنی خۆتانتان لەبەرچاو دەکەوێت. بەڵام ئەم قورئان خوێندنەیان، لە گەروویان ناترازێت. وەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، ئاوەها لە دین دەردەچن. تەنانەت بازووی یەکێکیشیان گۆشتە گرێیەکی گەورەی پێوەیە."[1]

ساڵەکان بە خێرایی تێدەپەڕین. هەروەك بڵێی ڕۆژەکان کێبڕکێیان بوو بۆ تەصدیق کردنی پێغەمبەری خوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). لە نەهرەواندا حەزرەتی عەلی هەموو خەواریجەکانی دایە بەر شمشێر. هەر لەوێشدا مژدەیان پێدا کە کابرایەکیان لەبەردەستدایە ڕێك بەو شێوەیە کە پێغەمبەری خوا وەسفی کردبوو. کەواتە ئەمە ئەو کەسانە بوون کە لە دین دەردەچوون و، لە دژی دین جەنگیان بەرپا دەکرد.[2]

لە فەرموودەیەکی ضعیفدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە حەزرەتی عەلی فەرمووە: " من لەپێناو تەنزیلی قورئاندا جەنگام، تۆش لە پێناو تەئویلیدا دەجەنگێیت." واتە، هەر کە قورئان دەستی کرد بە نازڵ بوون، هەموو خەڵکی لە دژم وەستان، جا منیش بەرەنگاریان بوومەوە. ڕۆژێکیش دێ، کەسانێك دێن بە هەڵە تەئویل و تەفسیری قورئان دەکەن، ئیتر تۆش لە بەرامبەر

---

١- البخاري، الأدب ٩٥ ـ المناقب ٢٥ ـ مسلم، الزكاة ١٤٢- ١٤٨. ( لە ڕیوایەتەکانی موسلیمدا، ئەم ڕووداوە بە درێژی باس کراوە.)

٢- البخاري، الأدب ٩٥ ـ مسلم، الزكاة ١٤٨ ـ إبن كثير، البداية و النهاية ٧/٢٩٠.

ئەوانەدا دەجەنگێیت.[1] جا کە وەختی هات، ئەویش ڕوویدا. حەزرەتی عەلی(ﷺ) لە دژی خەواریجەکان جەنگی بەرپا کرد و، بەرەنگاری ئەو کەسانە بووەوە کە وەك دەرچوونی تیر لە کەوان، لە دین دەرچووبوون.

بەڵێ، ئەو پیاوە لووت پانە، دەموچاو ئەبڵەقە، هەروەك ئەوەی بۆ تەصدیق کردنی پێغەمبەری خوا دروستکرابێت، وابوو. بەجۆرێك کە ئەو حاڵەتە نەرێنیەی ئەو، بە شێوەیەکی ئەرێنی ڕاست و دروستیی پێغەمبەری خوای دەردەخست. جا هەروەك چۆن ئەو پاداشتەی ئیماندار دەستی دەکەوێت لە ئەنجامی بەرەنگاربوونەوەی شەیتاندا، هیچ سوود و پاداشتێك دەستی شەیتان ناخات، ئاوەهاش بەو جۆرە، ئەو کابرایە، سەرەڕای ئەوەی بوو بە هۆکارێك بۆ تەصدیقی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام هیچ شتێکی دەست ناکەوێت. بەڵێ، هەرچەندە ئێمە لە پەڕاوی سیمای ناپەسەندی ئەودا، ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا دەخوێنینەوە، بەڵام ئەمە هیچ شتێك دەستی ئەو ناخات. چونکە ئەو لەم بابەتەدا جگە لە هۆکارێکی بەدبەخت چی تر نییە...

## ٥ ـ گەشت بە کەشتی و "ئوم حەرام"

بە گوێرەی یەکێك لە ڕیوایەتەکان، "ئوم حەرام کچی میلحان"، پووری شیریی پێغەمبەر بووە. ڕیوایەتێکی تریش باس لەوە دەکات کە خزمی نزیکی دایکی بووە و، بەم پێیە هەروەك پووری وابووە. جا بۆیە پێغەمبەری خوا وەك بچێتە ماڵی خۆیانەوە، ئاوا دەچووە ماڵیان و، جارجارەش لەوێ پشووی دەدا. جارێکیان کە بۆ پشوودان تەشریفیان چووبوونە ئەوێ، بەدەم زەردەخەنەوە لەخەو هەڵسا. ئوم حەرام هۆکاری ئەم زەردەخەنەیەی پرسی: " ئەی

---

١ - أحمد إبن حنبل، المسند ٨٢/٣ ـ أبو يعلى، المسند ٣٤١/٢ ـ حاكم، المستدرك ١٣٢/٣.

پێغەمبەری خوا، بۆچی زەردەخەنە گرتیتی؟ " ئەویش فەرمووی: " بینیم کەسانێك لە ئوممەتەکەم هەروەك پاشاکان، بەسواری کەشتی دەچوون بۆ جیهاد." جا کە ئوم حەرام ئەمەی بیست، یەکسەر وتی: " دوعام بۆ ناکەیت منیش لەوان بم؟! " پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: " تۆ لەوانیت." ئینجا پێغەمبەری خوا کەمێکی تر پشووی دا. ئەمجارەشیان بەدەم زەردەخەنەوە خەبەری بووەوە و هەمان شتی بە ئوم حەرام وتەوە. ئەویش دووبارە داوای کردەوە: " دوعام بۆ ناکەیت منیش لەوان بم؟! " لە بەرامبەر ئەم داواکارییەدا، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: " تۆ لە یەکەمینەکان دەبیت."

ساڵەکان یەك لەدوای یەك تێدەپەڕین. ئەوە بوو ئوم حەرام، لەگەڵ "عوبادەی کوڕی صامت"ی هاوسەریدا، هاودەم لەگەڵ یەکەم کاروانی موسوڵماناندا، بەسواری کەشتی بەرەو فەتحی "قوبرص" بەڕێکەوتن. بەڵام لەوێ ئوم حەرام لە وڵاخەکەی دەکەوێتە خوارەوە و گیان دەسپێرێت.[1]

ئیتر لەو ڕۆژەوە موسوڵمانان زیارەتی گۆڕەکانیان دەکەن و بەکوڵ بۆیان دەگرین. بێگومان هەر دڵۆپێکیش لەو دڵۆپە فرمێسکانە، صیدق و ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا دووپات دەکاتەوە. چونکە سەرووەرمان هەواڵێکی غەیبیی داوە و، ئەو هەواڵەش ملیم بە ملیم وەك خۆی هاتووەتەدی. قوبرص و مێژووەکەی، هەروەها گڵکۆی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش کە لەوێن، بەڵگەیەکی بەدرۆنەخراوەی ئەو ڕاستگۆییەن.

بەڵێ، جا کە وادەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا دێنە پێش، یەك بەیەك دەردەکەون و، ئێمەش بە تەماشاکردنیان لە ئاوێنەی مێژوودا، شایەتی خۆمان نوێ دەکەینەوە. لەهەر جارێکیشیاندا، بەئەندازەی گەردیلەکانی جەستەمان دەڵێین: " ڕاستت فەرمووە ئەی پێغەمبەری خوا."

---

١- البخاري، الجهاد ٣، ٨ ـ مسلم، الأمارة ١٦٠- ١٦٢.

بـەڵێ، لەوانەیـە گوزارشـت و دەربڕینـەکانی ئێمـە بـەس نـەبن بـۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە، بەڵام دڵنیام ئەو دەنگەی کە هەر ئیمانـدارێك لـە ناخی ویژدانی خۆیدا دەیبستێت، هێندە بڵند و زوڵاڵە گوێ پێنەدان و نکوڵی کردنی وەك ئەستەم بێت وایە...

## ٦ ـ بەنو قەنتورا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی ئەو گەلەی کە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا زاڵ دەبێت، فەرموویەتی:

فَإِذَا كَانَ آخِرُ الزَّمَانِ جَاءَ بَنُو قَنْطُورَاءَ عِرَاضُ الْوُجُوهِ صِغَارُ الأَعْيُنِ ذُلْفُ الأُنُوفِ.[١] " لە ئاخرزەماندا "بەنو قەنتورا" پەیدادەبن. ئەمانە گەلێکن دەموچاویان پانە و چاویان بچووکە و لووتیان پانە."

هەندێك لە پەڕاوەکانی مێژوو دەڵێن ئەو گەلە "مەغۆل"ەکان بووە. جا لە مێژووی جیهانی ئیسلامیدا دوو ژێردەستەیی گەورە و ترسناك هەن کە وەسفەکەی پێغەمبەری خوایان بەسەردا ساغ دەبێتەوە: یەکێکیان داگیرکارییەکەی "فێردیناند"ە لە ئەندەلوس، کە ئەمە لە هەموو ڕوویەکەوە شاڵاوێکی بەربەری و دڕندانە بوو. لەو شاڵاوە دڕندانەیەدا مرۆڤەکان کوشتوبڕ کران و کتێبخانەکانیش کرانە کاولە و سووتێنران. ئەوی تریشیان کارەسات و نەهامەتیی مەغۆلە. ئەوانیش هەرچی ناوەندی کلتووری و ئەدگاری شارستانی هەیە لە میسر و سوریا و ئەنادۆڵدا، هەر هەموویان خاپوور کرد و، گشت لایەکیان کردە وێرانە و پاشانیش بۆی دەرچوون.

---

١ - البخاري، الجهاد ٩٥، ٩٦ ـ أبو داود، الملاحم ٩- ١٠.

جا لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا زۆر خەمخۆری چارەنووسی ئوممەتەکەیەتی و لە نزیکەوە پەیوەندیدارە پێوەی، ئاوا بەم جۆرە هەواڵانە سەرنجیان ڕادەکێشێ و ئاگاداریان دەکاتەوە، هەروەك بفەرموێ: کاتێك ئوممەتی موحەممەد شایستەی سزادان دەبێت، خوای گەورە وەك ئامرازێکی تەمێکردن، ستەمکارانیان دەکا بەگژدا. بەڵێ، ستەمکار شمشێری خوایە. لەپێشدا تۆڵەی پێ دەسەنێت، ئینجا دەگەڕێتەوە و تۆڵە لەویش دەسەنێتەوە. واتە زاڵمیش لە زوڵمەکەیدا بەردەوام نابێت.[1] بەڵام لەسەرەتادا خوای گەورە ئەو زاڵمانە بەسەر موسوڵمانانەندا زاڵ دەکات، لە پاشاندا دەیانگرێت و بێخیان هەڵدەتەکێنێ و دەیانبا بەناخی زەویدا.

ئیتر بەم شێوەیە، پێغەمبەری خوا کە نموونەی بەرجەستەبووی شەفەقەتە، هۆشیاری دەداتە ئوممەتەکەی تا دووچاری ئاوەها عاقیبەت شەڕییەك نەبن و وێنەی ئەو بەلا و موسیبەتانەشیان بۆ دەکێشێت کە بەسەریاندا دێت، تا دوورەپەرێز بن لەو کردارانەی کە دەبنە مایەی کێشکردنی خەشم و تووڕەیی خوای گەورە.. بەڵێ، هەواڵدانی ئەو سەروەرە لەو ڕووداوانەی کە شەش حەوت سەدە دوای خۆی هاتنەدی، بەئاشکرا ڕایدەگەیەنێت کە ئەو پێغەمبەری خوایە.

## ٧ ـ فەتحی ئەستەمبووڵ

ئەستەمبووڵ، کە تا ئەو ڕۆژە بە " قوستەنتینییە" ناو دەبرا، فەتح دەکرێت و دەکەوێتە دەستی موسوڵمانان. حاکم لە "موستەدرەك"ەکەیدا، ئەم هەواڵە دەرئاسایەی پێغەمبەری خوا بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: لَتُفْتَحَنَّ

١ - " زوڵم و ستەم بەردەوام نابێت، بەڵام کوفر بەردەوام دەبێت." بڕواننە: المناوي، فيض القدير ١٠٧/٢. هەروەها بۆ ئەو فەرمایشتەی کە بە واتای: " خوای گەورە کەمێك دەرفەت دەدات بە زاڵم، بەڵام هەر ئەوەندەی گرتی و تۆڵەی لێسەندەوە، دەربازی نابێت." دێن، بڕواننە: البخاري، تفسير (سورة هود) ٥ ـ مسلم، البر ٦٢ ـ الترمذي، تفسير (سورة الأنفال) ١١.

الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ فَلَنِعْمَ الْأَمِيرُ أَمِيرُهَا وَلَنِعْمَ الْجَيْشُ ذَلِكَ الْجَيْشُ.[1] " هەڵبەت ڕۆژێك دێت قوستەنتینیە فەتح دەكرێت. جا سەركردەی ئەو فەتحە چەندە سەركردەیەكی چاكە، و ئەو سوپایەش كە فەتحی دەكات چەندە سوپایەكی چاك و پەسەندە."

خەریكە بڵێین هەرچی سەركردە مەزن و قارەمانە جیهانگیرەكانی مێژووی ئیسلامی هەیە، هەریەكەو لە سەردەمی خۆیدا، تەنانەت هەر لەسەردەمی ئەصحابی كیرامەوە(ﷺ)، لە پێناو بوونە هۆكاری بەدیهاتنی ئەو مژدە پیرۆزەدا، چەندین جار تا ئەستەمبووڵ هاتوون و گەڕاونەتەوە. حەزرەتی "ئەبوو ئەییوبی ئەنصاری"یش كە وەك گەوهەرێكی گرانبەها بە سنگی ئەو شارەدا هەڵواسراوە، یەكێكە لەوانە. وادەزانم دووبارە كردنەوەی كۆمەڵە باسێك كە لای هەمووان زانراوە، ببێتە مایەی وەڕس بوون و بەفیڕۆدانی كات. بەڵام دیسان پشت ئەستوور بەچاوپۆشینتان، دەمەوێت ئاماژە بۆ یەك دوو مەسەلە بكەم:

"ئولوباتڵی حەسەن"، ئەو قارەمانەی كە لە ڕۆژی فەتحی ئەستەمبووڵدا، بەسەر شوراكاندا سەركەوت و یەكەم ئاڵای چەقاند، سەربازێكی هەروا ئاسایی نەبوو. بەڵكو یەكێك بوو لەو ئەفسەرانەی كە لە "ئەندەروون"[2]دا پێگەشتبوو، لە هەمان كاتیشدا هاوڕێی سوڵتان "موحەممەدی فاتیح" بوو.

ئەوان چەند كەسێك بوون لەو سەردەمەدا. "خزر چەلەبی" یەكەم قازی ئەستەنبووڵ و، "ئولوباتڵی حەسەن"و "سوڵتان موحەممەدی فاتیح" تەنها سێ

---

١- أحمد إبن حنبل، المسند ٣٣٥/٤ ـ الطبراني، المعجم الكبير ٣٨/٢ ـ الحاكم، المستدرك ٤٦٨/٤.

٢ـ ناوی ئەو قوتابخانەیە بوو كە لە دەوڵەتی عوسمانیدا كاربەدەستانی دەوڵەتی پێدەگەیاند.

کەسایەتیی ئەو دەستەیە بوون کە خوێندن و پێگەیشتنی هەرسێکیان پێکەوە بووە.

ئەو ڕۆژەی شووراکان بەزێنران، ئولوباتلی لەپای بە بێژنگ بوونی جەستەی و ئەو هەموو برین و پێکانەی بەری کەوتبوو، چووە سەر شووراکان و توانی بەیداخەکەی هەڵبکات. پاش کەمێك موحەممەدی فاتیح لە پەنا سەری ئەم پاڵەوانەدا گیرسایەوە کە دوا ساتەکانی تەمەنی دەژیا. زەردەخەنەی سەر لێوی حەسەن، فاتیحی سەرسام کردبوو، بۆیە لێی پرسی: " هۆی ئەم زەردەخەنەیە چییە؟ " ئەویش وەڵامی دایەوە: " کەمێك بەر لە ئێستا رسول الله تەشریفی هێنا و ئەم ناوەی دەپشکنی. دیدەم بە بینینی جەماڵی گوڵینی شاد بوو، ئیتر چۆن شادمان نەبم.."

بەڵێ، نۆ سەدە پێشتر هەواڵی دابوو، نۆ سەدە دواتریش لەنێو ئەو سوپایەدا بوو کە ئەوێیان فەتح دەکرد. منیش پاڵپشت بەمە، هەموو جارێك وتوومە و هەر دەشڵێم: " ئەگەر سێ چوار کەس بە دڵێکی خاوێن و پڕ لە ئیخلاسەوە، لەپێناو خزمەتکردنی دینی خوادا لە شوێنێکدا کۆببنەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە ڕۆحیانەتی پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەوێدا ئامادە دەبێ و، خۆشیان و شوێنەکەشیان شەرەفمەند دەکات."

جا هەروەك چۆن فەتحی ئەستەمبووڵ بە وێنەی شایەتییەکانی تری صیدقی ڕەسوول، دەبێتە بەڵگەیەکی تر لە بەڵگەکانی ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا، هەر بەو جۆرە، ئەبوو ئەییوبی ئەنصاریش شاهیدێکی بەڵگە نەویستی تری ئەم شایەتییەیە. جا خۆ حەزرەتی ئەبوو ئەییوب لە پێشەنگی ئەوانەوە بوو کە مزگێنی ئەو فەتحەیان بیستبوو.. ئیتر ئا لەبەر ئەمە بوو، کە لە مەدینەی

مونـــەووەرەوە کـــەوتبووە ڕێ و، وەســـیەتی کردبـــوو کـــە لـــە ئەســـتەمبووڵ ئەسپەردەی خاك بکرێت.[1]

## ج ـ داهاتووی دوور

### ١ ـ وەهن (خۆشەویستی دنیا و ترس لە مردن)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی ئەو ڕووداوانەشی پێ ڕاگەیانـدووین کـە لـە ڕۆژگاری ئەمڕۆمانەوە زۆر نزیکن. یەك لەوانە:

يُوشِكُ اْلأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى اْلأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَومَئِذٍ؟ قَالَ: بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ، وَلَيَنْـزِعَنَّ اللّه مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ وَلَيَقْذِفَنَّ اللّهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ. فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللّهِ وَمَا الْوَهَنُ؟ قَالَ: حُبُّ الدُّنْيَا وكَرَاهِيَّةُ الْمَوْتِ.[2]

" هەروەك چۆن ئومەتەکان، گەلەکان، مرۆڤەکان یەکتری دەعوەت دەکـەن بۆ سەر سفرە، ئاوهـاش یـەکتری دەعــوەت دەکـەن بـۆ سـەر ئێـوە و دەدەن بەسەرتاندا." یەکێك پرسـی: " جـا ئایـا لەبەرئەوەیـە کـە ئێمـە کـەمین؟ " پێغەمبەری خواش لە وەڵامدا فەرمووی: " نەخێر بەپێچـەوانەوە، ئێـوە ئـەو ڕۆژە زۆرن، بەڵام هەروەك کەف و شەخەڵێکن کە لافـاو ڕایـدەماڵێ.. خـوای گەورە ترس و سامی ئێوە لەسنگی دوژمنانتاندا دەردەهێنێ و، "وەهن"یـش دەخاتە دڵی ئێوەوە." دیسان یەکێکی تر پرسـی: " ئـەی پێغەمبـەری خـوا،

---

١ ـ إبن حجر، الأصابة ١/٤٠٥.

٢ـ أبو داود، الملاحم ٥; أحمد إبن حنبل، المسند ٢/٣٥٩، ٥/٢٧٨.

وەهن چییە؟ " پێغەمبەری خواش فەرمووی: " خۆشویستنی دنیا و ڕقبوونەوە لە مردن."

لە یەکەم ڕوانیندا بۆ ئەو بڕگانەی سەرەوە، ئەم واتایانە حاڵی دەبین: ڕۆژێك دێت، گەل و نەتەوەکان بەکۆمەڵ دەدەن بەسەرماندا. وەك ئەوەی لەسەر سفرە خواردن دابەش بکەن، ئاوها سامانە زەمینی و ژێر زەمینییەکانمان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. بەڵێ، دەست دەگرن بەسەر هەموو سامان و سەرچاوەکانماندا، لەسەر زەوی بێت یان ژێر زەوی. هەر بە بەرچاوی خۆشمانەوە وەك بڵێی سفرەکانمان دەپێچنەوە و لووشی دەدەن. بەڵێ، خۆمان پارووەکەیان بۆ ئامادە دەکەین و پاشان دەیخەینە بەردەمیان، ئەوانیش بە ئیشتیهایەکەوە کە تێر بوون نازانێت، چڵێسانە هەموو ئەو شتانە قوت دەدەن کە دەخرێنە بەردەمیان.

هەموو ئەمانە لەپای چی؟ ئاخر چونکە ئەوکات ئێمە چی تر درەختێکی ڕەگ داکوتاو نین و، بووینەتە ئەو خۆڵ و خاشاکەی کە لافاو ڕایدەماڵێت. بەڵێ، لە بەرامبەر ئەو یەکتر خۆری و لە یەکتر خوێندنەی کە دەرەنجامی جیاوازی میزاج و مەشرەب و حیزب و بیروڕاکانمانەوە سەریان هەڵداوە، ئەوان لە دەوری بەرژەوەندییە نزمە دنیاییەکان کۆبوونەوە و، ئێمەیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیان. لەپێشدا ئەوان لە ئێمە دەترسان. چونکە ئێمە، هێندەی هەڵهاتنی ئەوان لە مردن، بەرەو ڕووی دەچووین و دنیامان بە کەم دەزانی. ئەی ئێستا؟ هەڵبەتە ئێستا ئێمە لە مردن ڕادەکەین و، لەوانیش زیاتر دنیامان خۆشدەوێت. ئیتر ئەوانیش ئەم لاوازییەی ئێمەیان قۆستووەتەوە و، لە هەستیارترین جێگەمان دەدەن.

جا ئەگەر کەمێك چڕتر بیرکردنەوەمان ئاراستەی ئەم فەرموودەیە بکەین، کە لەیەکەم ڕوانیندا وا دێنێت بەخەیاڵی مرۆڤدا کە مەبەستی شالاوی خاچ

پەرستان بێت، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە بە ئاشکرا ئامــاژەش دەکـات بــە کۆمەڵە ڕووداوێك کە لە مێژوویەکی زۆر نزیکتردا ڕوویانداوە.

بۆ نموونە: ڕائیف قەرەداغ کتێبێکی نووسی بەناوی "گەردەلوولی نەوت". بەڵام دواتر هەر لەلایەن ئەو دەستانەوە کە گەردەلوولەکەیان هەڵگیرساندبوو، تیرۆر کرا. چونکە ئەو کتێبە، لە لایەکەوە بەدبەختی و غەدر و واوەیلاکـانی مرۆڤی سەدەی نۆزدە و بیستی ئەو جوگرافیایە و، لەلایەکی تریشەوە " قاڵە و هاواری" دەستدرێژیکارانی لەخۆگرتبوو.

ئـەی چـۆن وەك سـفرەیەك دایــان بەســەر دەوڵـەتی عوسمانیــدا! هــەموو دەردەکەشیان ئەوەبوو دەست بگرن بەسەر سامانە سروشتییەکانی ئـەم خاکـە بەرین و دەوڵەمەندەدا. تەنانەت سەختترین هێرشی ئاشکرای خاچپەرستان بە درێژایی مێژوو، لەچاو ئەم دەستدرێژییە ژێربەژێر و پەنهانەی کوفردا، هێشتا بە بچووکی دەمایەوە. بەڵێ، وەك ئەوەی یەکتری بۆ سەر خوانێك بانگهێشـت بکەن، ئاوەها یەکتریان بانگێشت کـرد و، هەرچـی سـەروەت و بـوونی ئـەو میللەتە هەیە، لەنێوان خۆیاندا دابەشیانکرد...

ئەو زیهنییەتــەی کـە چـەرخی خیانــەتی لـەو سـەردەمەدا دەچـەرخاند، حــەزرەتی عوسمــان و حــەزرەتی عــەلی(ﷺ) لەپشــتەوە پێکـا و عەصــری سەعادەتی بەخوێن سوور کرد. جا هەر نـەوەکانی ئـەوانیش بـوون، کـە لـە پشتەوە خەنجەریان لە ئالی عوسمان دا و جیهانی ئیسلامییان بێ سەر کرد.

ئیتر بەو جۆرە، وەك ئەوەی بەرەو سفرەیەکی ڕازاوەی ئامادەکراو ڕابکــەن، ئاوەها داباریـنە سـەرمان. جا هەروەك "موحەممەد عاکیف"[1] دەڵێت: " کێیان

---

١ ـ شاعیری نەتەوەیی تورکیایە و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٣-١٩٣٦ ز)دا ژیاوە. سەرجەم شیعرەکانی لە دیوانێکدا کۆکراوەتەوە بە ناوی: " الصفحات".

هیندی و کێیان گۆشت خۆر، کێشیان نازانم چ بەڵایەك بوو." ئیدی هەموو ئەمانە خڕبوونەوە و دەوڵەتی عوسمانییان بە تالان برد...

لە ڕابردوودا هێرشبەران بە زیهنیەتێکی دیاریکراوەوە هێرشیان دەکردە سەرمان. ئەمەش لە هێرشی ئەوروپای دەمارگیردا خۆی دەبینییەوە. ئەو داماوە چەواشەکراوانە، بە عەقڵی خۆیان بۆ ڕزگارکردنی گۆڕی حەزرەتی مەریەم دەهاتن. هەڵبەتە نەیاندەزانی کە حەزرەتی مەریەم(عَلَيْهَا السَّلَامُ) لە دیدی ئێمەدا، زۆر فەزیلەتدارتر و پایە بڵندترە لەوەی ئەوان باوەڕیان پێیەتی. ئاخر ئێمە باوەڕمان وابوو کە ئەو لە بەهەشتدا دەبێتە خێزانی سەروەرمان و بەو چاوەوە تەماشامان دەکرد کە دایکی ئیماندارانە.[1] خۆ ئەگەر حەزرەتی مەریەم لە ژیاندا بووایە، ئەوا لە بەرامبەر بیروباوەڕی باطل و پەژموردەی ئەواندا، کە ئەویشی بێزار و ناڕەحەت دەکرد، دەبووینە پارێزگاری ڕاستەقینەی حەقیقەتەکەی...

ئەوەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە: شاڵاوی خاچپەرستان بەرهەمی ئەو زیهنیەتە نابووتە نییە کە پێغەمبەری خوا ئاماژەی پێدابوو لەو فەرموودەیەدا کە کردبوومانە بنەڕەتی باسەکەمان. بەڵکو مەبەستی ئەو ڕێککەوتنە ترسناکەی کوفرە، کە لە ڕابردوویەکی نزیکدا بە هەموو سام و بیمێکیەوە بینیمان و تا ئێستاش هەر دەیبینین. بەڵێ، تا ئەم ساتەش جیهانی ئیسلامی سفرەیەکی کراوەیە بەڕوویاندا و نەیتوانیوە لەو حاڵەتەی دەرباز ببێت. جا هەروەك بینیتان، ئەو ڕووداوانەی چواردە سەدە لەمەوپێش هەواڵیان درابوو، ئەمڕۆ وشە بە وشەیان هاتۆتەدی و بوونەتە بەشێك لە واقیع.

---

١ـ الطبراني، المعجم الكبير ٦/٥٢، ٨/٢٥٨.

## ٢ ـ فیتنەی کۆمیونیزم

ئیبن عومەر(رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە: " ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ڕووی کردە لای خۆرهەلاّت و فەرمووی: أَلاَ إِنَّ الْفِتْنَةَ هَاهُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ.[1] " وریا بن، فیتنە ئا لێرەوە سەرهەڵدەدات ، لەو شوێنەوە کە چاخی شەیتانی تێدا بلاّوبووەتەوە."

ئەگەرێکی بەهێز هەیە کە پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەم فەرموودەیەیدا ئاماژە بۆ ئەو فیتنەیە بکات، کە وەك بەدیلێك بۆ ستەمکاران و کافرانی خۆرئاوا، لە خۆرهەلاّتدا سەرهەڵدەدات.

جا وشەی " قَرْن" کە لە دەقەکەدا هاتووە، هەروەك چۆن بە مانای شاخ یان قۆچی ئاژەڵ دێت، ئاوهاش بەمانای سەدە یان سەردەم دێت. بۆیە وا پەسەنترە کە زیاد لە واتای شاخ، "سەدە" یاخود "سەردەم" بەهەند وەربگیرێت. هەرچی " قَرْنُ الشَّيْطَانِ" یشە، بەواتای "سەردەمی شەیتان" دێت کە پێچەوانەی عەصری سەعادەتە. سەردەمی شەیتان ئەو سیستەمە نەگریسەیە کە لەسەر بناغەی ئینکاری کردنی ئولوهیەت (خوایەتی) دامەزراوە و، ئامانجیشی بلاّوکردنەوەی ئیلحاد و، ئیباحیەت (بەدڕەوشتی) و هەموو ئەو خراپەکاریانەیە کە لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ، شەیتان لە ڕێگەی نەفسی ئەمارەی بەدخوازەوە هەوڵی داوە بیچرپێنێ بە ناخی مرۆڤدا. ئەگەرچی ئەم سیستەمە تۆقێنەرە، کە ڕۆڵەی ناشەرعیی ڕژێمی سەرمایەدارییە، ئێستا وا لە گیانەلاّدایە، کەچی تا ئەم ساتەش لەسەر زەوی، پاڵەوانی بێ ڕکابەری دوژمنایەتی کردنی دین و دیانەت و موقەددەسات و

---

١ـ البخاري، الفتن ١٦ ـ مسلم، الفتن ٤٥-٥٠.

مێژوو و تەنانەت دیموکراسیشه و، بووەته خەونی ترسناکی مرۆڤەکان.[1] بۆیە وا دەبینم پێغەمبەری خوا ئەو سەردەمەی کە ئەم سیستەمەی تێدا بالادەستە، بە شوێنکەتووانیشییەوە، بە"سەردەمی شەیتان" ناوزەد دەکات. ئیتر بەمجۆرە هۆشیاریی دەداتە ئوممەتەکەی لە بەرامبەر ئەو قەیرانە جیهانییانەوە کە ئەم سەردەمە لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت.

## ٣ ـ گەنجینەکەی فورات

پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ:

يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ (أَوْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ) فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئاً.[2] " نزیکە ڕووباری فورات ڕۆبچێ و چیایەکی ئاڵتون دەربخات. ئەگەر هەر کەستان لەوێ بوو با هیچی لێ هەڵنەگرێ."

تا ئێستا چەندەها جەنگ و کوشتاری گەورە لە نزیك فوراتدا ڕوویانداوە. جا ئەگەر لە مێژوویەکی نزیکەوە دەست پێبکەین، دەبینین جەنگێکی مەزن لە نێوان عێراق و ئێراندا لە نزیك ڕووباری فوراتدا ڕوویدا. لە ساڵی (١٩٥٨) یشدا هەر لە نزیك ئەو ڕووبارەدا، کوشتارگەیەك ڕوویدا و چەندەها کەس لە نەوەکانی پێغەمبەری خوای تیادا کوژران.. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت ئەو دوو ڕووداوەی سەرەوە ببنە ڕاڤە و مەبەستی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا. بەڵکو وا گونجاوترە بە دووی ئەو ئاماژانەدا بگەڕێین، کە بۆ کۆمەڵە ڕووداوێك کراون کە لەوانەیە لە داهاتوودا ڕوویدەن. بۆ نموونە:

---

١ - ئەم لێکدانەوەیە لە ساڵی ١٩٨٩ دا کراوە.

٢ـ البخاري، الفتن ٢٤ ـ مسلم، الفتن ٣٠-٣٢.

هەروەك چۆن دەكرێ بە شێوەیەكی مەجازی ئاماژە بێت بۆ ئەو سەردەمەی كە ئاوی فورات وەك ئاڵتون بەنرخ دەبێت، ئاوهاش دەگونجێ وشەی "ئاڵتون" هێما بێت بۆ ئەو داهاتەی لە ئەنجامی دروستكردنی بەنداو و بەربەستەكانەوە بەدەست دێ. هەروەك دەشگونجێ هەواڵی ئەوە درابێ كە ئاوی فورات بەتەواوی وشك دەبێ و لەژێریدا چەندین پاشخان و سەرچاوەی ئاڵتون و نەوت دەردەكەون. ئەمە جگە لەوەی كە دەكرێ لە ئەنجامی داڕمانە خاكیەكانەوە كان (معدن)ێكی لەو شێوەیە بدۆزرێتەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت، گومان لەوەدا نییە فەرموودەكە باس لە مەترسی ئەو ناوچەیە دەكات، كە وەك بۆمبێكی تەوقیتكراو وایە لە جەستەی جیهانی ئیسلامیدا. ئەمانە شتانێك نین ئەمڕۆ دەركەوتبێتن، بەڵكو ڕووداوگەلێكن لە داهاتوودا ڕوودەدەن.. ئیدی ئەوانەی بەو ڕۆژگارە دەگەن، سەرلەنوێ لە ناخی دڵیانەوە دەڵێن: " ڕاستت فەرمووە ئەی پێغەمبەری خوا." و بەمەش ئیمانەكەیان تازە دەكەنەوە.

## ٤ ـ پاڵفتەبوونی مەسیحییەت

سەرداری هەردوو جیهان(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) هەواڵی ئەوەمان دەداتێ كە ئاینی مەسیحی پاڵفتە دەبێ و، ئاوێتەی ڕۆحی موحەممەدی دەبێت.[١] بەڵێ، لە كاتێكدا نوێنەرانی ئینكار و بێباوەڕی ئیمانداران دەستگیر دەكەن، ئەوانەی كە هێزی ئاسمانییان بەدەستە، بە پشتیوانی پەروەردگار جارێكی تر بەدبەختی موسوڵمانان دەگۆڕن و، لووتی ئیلحادیش جارێكی تر دەشكێنەوە.. لەم جەنگە جیهانییەدا هەموو لایەك پڕ دەبێت لە تەرم و جەستەی مردوو. ئینجا

١ - البخاري، الأنبياء ٤٩ ـ مسلم، الأيمان ٢٤٤-٢٤٧.

هەڵۆکان هەڵدەستن بە گواستنەوەی ئەو تەرمانەی کە سەرزەوییان داپۆشیوە.[1] ئاماژەی ئەم هەڵۆیانە بۆ دەزگایەکی دیاری کراو چەندە مانابەخشە!

## ٥ ـ چاکسازی لە کشتوکاڵدا

چەندین چاکسازی و پێشکەوتن لە بواری کشتوکاڵدا ئەنجام دەدرێت. لە سایەی ئەو پێشکەوتنانەوە، هەناری وا دێتە بەرهەم کە بیست کەس ئینجا دەتوانن تەواوی بکەن و، سێبەری توێکڵەکەشی مرۆڤێك دادەپۆشێت.[2] هەروەها دەنکە گەنمیش بەوجۆرە گەورە دەبێت. ئەمانە شتانێکن ئێمە لە ڕۆژگاری ئێستاماندا نایانبینین، بەڵام بەدڵنیاییەوە لە داهاتوودا دەبینرێن. جا کە ئەو ڕۆژە دێت، دەوترێت: " بەڕاستی تۆ نێرراوی پەروەردگاریت." ئیتر بەم شێوەیە، ڕایەڵەکانی وابەستەبوون بە پێغەمبەری خواوە نوێ دەکرێنەوە و پتەوی بەدەست دێنن. چونکە سەدەکان ڕاستیی و دروستیی ئەو دەردەخەن و، هەموو فەرمایشتەکانی یەك بە یەك دەخەنە پێش چاوان.

ئێمە شەیدا و تامەزرۆی ئەو "سبەینێ"یەین کە لە ڕەحمی زەمەنەوە چاو بە دنیا هەڵدێنێت. ئەوە سبەینێیەکە جگە لەو، هیچ ڕۆشناییەکی تر نییە.. خۆ ئەگەر ساتێك خامۆش ببێت، ژیان سەرتاپا دەبێتە شەوی یەلدا. دەك ڕۆحت شاد بێ عاکیف!

---

١- مسلم، الايمان ١١٠ ـ الترمذي، الفتن ٥٩.
٢- مسلم، الفتن ١١٠ ـ الترمذي، الفتن ٥٩.

## ٦ ـ ناهاوسەنگییەكانی سەردەم

با بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو هەواڵ و ئاماژانەی كە پەیوەندییان بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمانەوە هەیە. پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) دەفەرموێت:

إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تَسْلِيمَ الْخَاصَّةِ وَفُشُوَّ التِّجَارَةِ حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِ، وَقَطْعَ الأَرْحَامِ وَشَهَادَةَ الزُّورِ وَكِتْمَانَ شَهَادَةِ الْحَقِّ وَظُهُورَ الْقَلَمِ.[١]

" لەدەمی نزیك بوونەوەی قیامەتدا، سەلامكردنی تایبەتی (واتە دیاری كردنی ئەو كەسانەی سەلامیان لێدەكرێت) سەرهەڵدەدات. بازرگانی بەجۆرێك گەشە دەسێنێت، تەنانەت ژن هاوكاری مێردەكەی دەكات لە بازرگانیدا. سیلەی ڕەحم دەپچڕێنرێت. لە كاتێكدا كە شایەتی درۆ دەدرێت، كەچی شایەتیدانی حەق دەشاررێتەوە. قەڵەمیش برەو دەسێنێت."

ئەم فەرمایشتە وا بەڕوونی ڕۆژگاری ئێستامان وەسف دەكات، جێ بۆ هیچ ڕاڤە و لێكدانەوەیەك جێناهێڵێت.

بازرگانی بەجۆرێك برەو دەسێنێت، سەرمایەی ملیارەها و تریلیۆنەها، مامەڵەی پێوەدەكرێت. تەنیا لە ڕێكلامەكاندا ملیۆنەها و ملیارەها خەرج دەكرێت. ئافرەتیش لەم نێوەندەدا زۆربەی جار وەك ئامرازی ڕێكلام كردن بەكاردەهێنرێت. جاری واش دەبێ ئافرەت ڕاستەوخۆ دەچێتە دنیای بازرگانییەوە و، لە بازاڕ و پێشانگەكاندا خۆیان دەبنە ڕێكلامكاری خۆیان. تكام وایە گومان نەبەن كە من دژی بازرگانی بم. بەڵكو تەنها دەمەوێت ئاماژە بە ڕاستی و دروستی ئەو هەواڵە بكەم كە پێغەمبەری مرۆڤایەتی(ﷺ) باسی كردووە.

---

١ - أحمد بن حنبل، المسند ١/١٠٧-١٠٨، ٤١٩-٤٢٠ ـ البخاري، الأدب المفرد ٣٦٠ ـ حاكم، المستدرك ٤/٩٨.

سیلەی ڕەحم دەپچڕێنرێت و، مافی دایك و باوك و خزمە نزیکەکان دەخرێنە ژێر پێ و پێشێل دەکرێن. کاتێکیش دایك و باوك پیر دەبن و کەڵکی هیچیان نامێنێت، واتە ڕێك لەو کاتەدا کە ئاتاجی شەفەقەت و چاودێرین، ڕادەستی خانەی پەککەوتە و خەڵوەتگەی پیران دەکرێن. ئیدی ئەو مرۆڤە بەساڵاچووانە هەوڵدەدەن لەوێدا ئەو ئاسودەییە بەدەست بهێنن، کە لە ماڵەکانی خۆیاندا لەدەستیان دابوو.. وێڕای ئەوەی خوای باڵادەست لە پاش زاتی مەزنی خۆی، گەورەترین مافی بەوان بەخشیوە،[1] کەچی ئەم فەرمانەی پشتگوێ دەخرێت و، بەجۆرێکی ناڕەوا و دوور لە بەزەیی، کە تەنانەت وا لە مرۆڤ دەکات ڕەحمەت بۆ دڕندەترین بەربەرییەکان بنێرێت، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.( جا ئایا ئەو شتانەی باسکران، بەسەر ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەچەسپێن یان نا؟ وەڵامی ئەمە بەجێدەهێڵم بۆ دەرك و عیرفانی خوێنەری هێژا.)

قەڵەم پەرەدەسەنێت و، چاپخانەکانیش بێ وەستان لەکاردا دەبن و، سەرگەرمی لە چاپدانی ڕۆژنامە و، گۆڤار و، کتێب دەبن. دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەش بەردەوام کتێب و، ئینسایکلۆپیدیا بڵاودەکەنەوە تا ئەوەی ڕەفی کتێبخانەکان پڕ دەبن لە هەزاران جۆری کتێب. نووسین دەبێتە پیشە و، نووسەرییش پەرە دەسەنێت.

شایەتیی ناهەق و درۆ، کۆمەڵگە دەهەژێنێت و کەسیش لە شایەتیی هەق نزیك نابێتەوە. ژیانی کۆمەڵایەتیش وەك بڵێی دەبێتە کارگەیەك بۆ بەرهەم هێنانی درۆ. ئیتر لە دنیایەکی وادا، درۆ و خیانەت و ساختەکاری تا ڕادەیەکی بەرچاو دەبنە تەوەرەی ژیان...

---

١ ـ ( سورة البقرة: ٨٣)، (سورة النساء: ٣٦)، (سورة الأنعام: ١٥١)، (سورة الأسراء: ٢٣)، (سورة لقمان: ١٤).

جا وەك دەبینن، هێندە بە ڕوونی گوزارشت لە بابەتەکەکان کراوە، کە لەوانەیە ئەم گومانە بە مێشکی هەندێ کەسدا بێت: " تۆ بڵێی بە ڕاستی ئەم فەرمایشتانە هی سەروەرمان بن؟ "

وەڵامی ئەمەش لەوپەڕی سانایدایە: ئەم وتانە، لەو کتێبی فەرموودانەدا هەن، کە بە لایەنی کەمەوە سیانزە سەدە لەمەوبەر تۆمار کراون. جا ئەگەر ئەم وتانە هی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبن، ئەی هی کێن؟ کێ توانای ئەوەی هەیە وەك ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێ، باس لەو ڕووداوانە بکات کە ئەو هەموو سەدەیە دوای خۆی دێنە گۆڕێ؟ خۆ ئەگەر ئەو وتانە هی هەر کەسێکی تر بن جگە لە پێغەمبەری خوا، مەگەر نابێت لانی کەم هێندەی سەروەرمان دارای ڕوانینێکی نورانی بێت؟ جا ئایا لە مێژوودا کەسێکی تر هەیە هاوشانی پێغەمبەر بێت، تا ئەم فەرمایشتانەی بدرێنە پاڵ؟ نەخێر، ئەم فەرموودە غەیبییانە، هەموویان بۆ پێغەمبەری خوا دەگەڕێنەوە. چونکە پەروەردگاری فێری کردووە و، ئەویش ئێمەی لێ ئاگادارکردوونەتەوە. بەڵێ، ئەم ڕووداوانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ڕوودەدەن، زۆر بە ڕوونی مەودای ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوامان(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) بۆ دەردەخەن.

## ٧ ـ بڵاوبوونەوەی زانست

لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە، کە خوای باڵادەست دەفەرموێ:

أبثُّ الْعِلْمَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ حَتَّى يَعْلَمَهُ الرَّجُلُ وَالْمَرْأَةُ وَالْعَبْدُ وَالْحُرُّ وَالصَّغِيرُ وَالْكَبِيرُ.[1] " لە ئاخر زەماندا، بەجۆرێك زانست و زانیاری بڵاودەکەمەوە، تا ئەوەی هەرچی پیاو و ژن، کۆیلە و ئازاد، بچووك و گەورە هەیە فێری دەبن."

١- الدارمي، المقدمة ٢٧ ـ أبو نعيم، حاية الأولياء ٦/١٠٠.

سەرجەم چین و پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگە، لە ناوەندەکانی فێربووندا سەرگەرمی بەدەستهێنانی زانست دەبن، بە جۆرێك هەروەك بڵێی دەکەونە پێشبڕکێ کردنی یەکتری لەم بوارەدا. کردنەوەی ئەو هەموو خوێندنگە و، بونیاتنانی ئەو هەموو زانکۆ و، تەرخانکردن و بە گشتی کردنی هۆکارەکانی بەدەستهێنانی زانیاری و پەیوەندی لەسەر ئاستی جیهانی بۆ ئەم بوارە، ئەوە دەردەخات کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەم فەرمایشتەیدا کە لە پەروەردگارییەوە دەیگێڕێتەوە، ئاماژە بۆ سەردەمی زانست و زانیاری دەکات. پێشکەوتنەکانیش لەم بوارەدا وتەکانی سەروەرمان پشتڕاست دەکەنەوە. وەك بڵێی زمانحاڵی هەر ناوەندێکی زانستی بریتی بێت لە: " ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ گوفتار دروستیت." جا کاتێك زانست دەخرێتەوە سەر ڕێچکە ڕەسەنەکەی خۆی، زانستەکان هەر خۆیان ئەم گەواهییە دەدەن...

## ٨ ـ هەڵهاتن لە قورئان

هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) لە فەرموودەیەکی تریدا، کە دەقاودەق بەسەر واقیعی ئەمڕۆماندا دەچەسپێت، دەفەرموێ:

لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُجْعَلَ كِتَابُ اللهِ عَاراً وَيَكُونَ الإِسْلاَمُ غَرِيباً.[١]

" قیامەت هەڵناسێ تا قورئان نەبێتە مایەی شەرم و نەنگی بۆ هەڵگرانی و، ئیسلامیش غەریب و نامۆ نەبێتەوە."

لە کاتێکدا کافر بەئاشکرا کوفرەکەی ڕادەگەیەنێت، کەچی موسوڵمان وەك ئەوەی موسوڵمانێتییەکەی مایەی شەرمەزاری بێت، بەشەرم و دڵەڕاوکێوە باسی لێوە دەکات. لە بەرامبەر بانگەشەی ئاشکرای ئەوانیشدا

١ - إبن أبي الدنيا، العقوبات ٢١٦.

بۆ بیرورِا و بڵاوکراوەکانیان لـە پـاس و فرۆکـە و جێگاکـانی تـردا، کەچـی موسـوڵمانان نـاتوانن تەنانـەت قورئانەکانیشـیان بکەنـەوە و بیخوێننـەوە. دەکەونە ژێر فشارێکی دەروونی ئەوتۆوە، کـە ئەگـەر لـە ڕواڵەتیشـدا هـیچ یاساغێك نەبێت، کەچی لەژێر کاریگەریی ئەو پەستانەدا، هەست بە شەرم و تەریقی دەکەن و، ئەوە دەشارنەوە کە لایەنگری قورئانن.

جا ئایا ئێستا ئیمکانی نکوولّی کردنی ئەم ڕاستییە لە توانادایە؟ مەگەر ئەمە یەکێك نییە لەو ئەهامەتییانەی کە موسوڵمانانی ئەمڕۆ گیرۆدەی بوون؟ مەگەر ئیسلام بەهەموو شتێکییەوە غەریب نەبووە؟

جا با لێرەدا دەست لە وێناکردنی ئەم ڕەوشە ناسۆرەمان هـەڵبگرین، کـە مایەی بەزەیی پێداهاتنەوەیە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا چەندین سەدە بـەر لـە ڕوودانیان و بەو شێوەیەش کە ڕوودەدەن، هەواڵی سـەرجەم ئـەو ڕووداوانـەی ڕاگەیاندووە.. ئینجا کە وادەی ڕوودانیان دێتـە پـێش، بـەوجۆرەی هـەواڵیان دراوە بگرە بە بچـووکترین وردەکارییەکانیشـیانەوە دەردەکـەون و تەصـدیقی پێغەمبەری نازدار(ﷺ) دەکەن. جا ئیتر نازانم، هەموو ئەمانە بـەس نـین بـۆ ئەوەی بگەڕێینەوە و سەرلەنوێ بەیعەت بەو زاتە بدەینەوە..؟

### ٩ ـ چەمكی كات

پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا، لەو شوێنەدا کە وەك یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت باس لەوە دەکات کە قورئان دەبێتـە مایـەی شەرم، بەردەوام دەبێ و، دەفەرمویّ: " قیامەت هەڵناسێ هەتا لەیەکتر نزیك بوونەوە و هاتنەوەیەك لە کات و دوورییەکاندا ڕوونەدات." [١]

---

١ - البخاري، الأستسقاء ٢٧، الفتن ٢٥ ـ الترمذي، الزهد ٢٤ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٥/٥١٩.

وشەی " تَقارُب" کە لە دەقەکەدا هاتووە، بە واتـای نزیکبوونـەوەی دوو شت دێت لە یەکتری. جا بەم شێوازە دەربڕینە، پێغەمبەری خوا، لە لایەکەوە ئاماژە دەکات بۆ ڕێژەیی (إضافي) بوونی کات (الزمان) و لە لایەکی تریشەوە ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە دەتوانرێت لە ماوەیـەکی زەمـەنیی کورتـدا، ئـەو کارانە ئەنجام بدرێن کە لەو سەردەمەدا کاتێکی زۆری خایانـدووە. ئـیتر ئـەو ڕاسـتییەی کـە گشـت کایـەکانی ژیـان، بـەهۆی شۆڕشـی پیشەسـازی و تەکنەلۆجیاوە هەنگاویان ناوەتە چاخی خێراییەوە، لەو بابەتە بەدیهییانەیە کە تەنانەت منداڵانیش فامی دەکەن. جا هەروەك چۆن لە فەرموودە پیرۆزەکـەدا تیشك خراوەتە سەر ئەم ڕاسـتییە، هـەر بـەو جـۆرەش ئامـاژە بـە هۆکـارە خێراکانی گواستنەوە و گەیاندنی ئەمڕۆ کراوە، کە دوورییـەکانیان بەتـەواوی کورت کردووەتەوە. هەروەها لە فەرموودەکەدا، پەنجە خراوەتە سەر بابـەتێك کە پسپۆڕانی بواری گەردوونزانی و فیزیای گەردوونی تێیدەگـەن. گـۆی زەوی بە تێپەڕبوونی کات، شێوەیەکی هێلکەیی (Elliptical shape) وەردەگرێت. ئەم گۆڕانکارییە، کاریگەریی لەسەر کاتیش دەبێـت. ئـیتر بـێ ئـەوەی هەسـتی پێبکەین، سـەعاتەکانمان هـەروەك چـۆن ڕەوشـی جیهـانیش، دەکەونـە ژێـر کاریگەریی ئەم گۆڕانکارییـەوە.

بە تێگەیشتنی من، ئەم فەرموودەیە ڕوویەکی تریشی هەیە، کە ئەمەیە: کات بوونێکی گوێرەیی (الوجود الأعتباري) هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لـە هەر جێگەیەکدا بێت کات هەر کاتە. بـۆ نموونـە، ئەگـەر بچـین بۆ "کـەلووی گاجووت" و لەوێشەوە تەماشای تەمێکی گەردوونی (nebula) بکەین کە چل ملیۆن ساڵی ڕووناکی لێمانـەوە دوورە و، بـە خێرایـی سـەد و پـەنجا هـەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا لێمان دوور دەکەوێتـەوە، ئـەوا چـەند کـاتێکی زۆر جیاواز و جۆراوجۆر دەبینین. جا ئەم یەکەیە، لە تەمێکی گەردوونی دیکەشدا،

که به نیوەی خێرایی ڕووناکی لە دوورکەوتنەوەدا بێ، هەر بە پێوەرێکی کاتی دادەنرێ. بەڕەچاوکردنی ڕێژەکان، بۆ ئەوانەی لە ئاستە نزمــەکانی تریشــدان، هەر هەمان شتە...

بەڵێ، خۆ ئەگەر ڕۆژێك بێت و مرۆڤ ئـەو توانایــەی هـەبێت کـە بچـێتە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر، ئەوا پێدەچێت ئەو تێگەیشتنەی کە ئێستا هەیـەتی لەمەڕ چەمکی کات، بەتەواوی سەرەوژێر ببێتەوە.

ئەوەتا بە دوو وشەی ڕازئـامێز و ئەفسـووناوی کـە" تقـارب الزمــان "ە، پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ) بە یەکجار ئاماژە بە چەمکی کات و، چـەندەها پێوەری زەمەنیی تر دەدات، کە لە پاشەڕۆژدا دێنە ڕێمان.

جا ئێستا دەپرسین: ئایا دەکرێ ئەم وتانە، وتەی مرۆڤ بن؟ داخـۆ غـەیری ئەو زاتەی کە زەمان و مەکان لە دەستی قودرەتیدا هەڵدەسوڕێنێ، کێـی تـر دەتوانێ ئەم حەقیقەتانە بزانــێ؟ تکـا دەکـەم، ئایـا ئەمانــە شــتانێکن کـە کەسێکی نەخوێندەوار، لـە سـەردەمێکی پـڕ لەنەخوێندەواریـدا بیانزانێـت؟ هەڵبەتە نەخێر. بەڵکو خوای تەبارەك تەعالا هەموو ئەم شتانەی فێرکردووە. ئیتر ئەو سەروەرەش تەنها ئەو شتانەی ڕاگەیاندووە، کە پـەروەردگاری فێـری کردووە.

ڕۆژ و مانگ و ساڵ و سەدەکان، یەك لەدوای یەك دێن و دەڕۆن. زانست و تەکنەلۆجیاش بە چەندین هـەنگاوی زەبـەلاح لـە پێشـڕەویدایە. کـاتێکیش دەگەنە دوا ئامــانج، ئـەو ڕاسـتییانەیان بـۆ دەردەکـەوێت کـە پێغەمبـەری خوا(صَلَّىٰاللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) پێش چەندین سەدە بینیونی و لەبارەیانــەوە دواوە. ئیـدی بابای زاناش سـەرسـامیی خۆی پـێ نـاشــارڕێتەوە و لـە نــاخی دڵییــەوە دەڵێت: " ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ بۆ خۆت خودی ڕاستگۆییت."

## ١٠ ـ بلاوبوونەوەی سوو (الرِّبا)

ڕۆژێك دێت سیستەمی سـووخۆری و فـایز تـا دەتوانێـت بلاودەبێتـەوە. تەنانەت ئەو کەسەش کە خۆی مامەڵـەی پێـوە ناکـات، نـاتوانێ خـۆی لێ ببوێرێ و تۆز و پریشکەکەیی هەر بەردەکـەوێت. پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە فەرموودەیەکی مویارەکیدا، ئاماژە بۆ ئەم پەتایە دەکات کە بـە یـەکێك لـە گەورەترین نەخۆشییەکانی ئەم سەردەمەمان هەژمار دەکرێ و، ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕەهەندە ترسناکەکانی لە پەرەسەندندایە:

لَیَأتِیَنَّ علی الناسِ زمانٌ لا یَبقی مِنهُم أحَدٌ اِلاّ أکَلَ الرِّبا فَمَن لم یاکُل أصابَهُ مِن غُبارِهِ.[١] " ڕۆژگارێـك بەسـەر خەڵکیـدا دێـت، کەسـێکیان تێـدا نامێنێت سوو نەخوات، هەرکەسیش نەیخوات ئەوا تۆزەکەی بەردەکەوێت."

فەرموودەکە سەرنجمان بۆ لای دوو خاڵ ڕادەکێشێت:

یەکەمیان: بەهۆی ئەوەی کە سەرجەم دارایی و سامانی دەوڵەت لە بۆتەی سووەوە بەدەست دێت و دەزگا داراییەکان، بانك بن یان بانك نەبن، لەم ڕووەوە وەك یەك مامەڵە دەکەن، ئەوا مرۆڤ هەرچـەندێکیش هەسـتیاری بنوێنێـت، بەدڵنیاییەوە پشکی خۆی لەم پەتا گوێزراوەیەی کە سەرتاپای ژیـانی تـەنیوە بەردەکەوێت. واتە چەند پریشکێکیش بەر ئەو دەکەوێت. ئەوەندە هەیە مرۆڤ لەوەها هەلومەرجێکدا تەنها بە نییەتی قوتاری دەبێت و، نیازی دڵی دەبێتـە پەناگە و دالدەدەری.

دووهەمیان: لە زمانی عەرەبیدا تەپوتۆز پیاپژان واتایەکی تریشی هەیـە. کەسانێك سووخۆری دەکەن، ئەوانەش کە ئەم کارە ناکەن، بەر تەپوتۆزەکـەی

---

١- أبو داود، البیوع ٣ ـ النسائي، البیوع ٢ ـ إبن ماجة، التجارة ٥٨.

دەکەون. لە کاتێکدا چینی سەرمایەدار لە ڕێگەی سووخۆرییەوە سەرمایەکەی خۆی گەشەپێدەدا، چینی هەژاریش بە هەمان ڕێژە، بێنەوا و کەساس دەبێت. ئیتر بەم شێوەیە تەپوتۆز و هەرای ململانێ و کێشمەکێشی بێ ئەمانی نێوان ئەم دوو چینە، کۆمەڵگە هەراسان دەکات و، ڕۆژێکیش دێت دەگاتە ئاستێك هەمووان بێزار دەکات.

پێم وایە هەموو ئەمانە هاتوونەتە دی و، لە هاتنەدیشدان. ئەوەتا ئەو لایەنانەی کە ئەم فەرموودە پیرۆزە بە هەردوو ڕووەکەیەوە ئاماژەی بۆ دەکات، ئێستا بە هەموو ڤیزەونییەکیەوە لەبەرچاوی مرۆڤی ئەم سەردەمەدایە. بە جۆرێك خەریکە بڵێین، دامەزراوەیەکی بازرگانی نەماوە کە ـ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ـ بە سووخواردنەوە تێوەنەگلابێ. هەرچی بازرگانی هەیە لە جیهاندا، گشتی لەنێوان جەڕ و پێچەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا هەڵدەسوڕێ و، تێکڕای دنیا، مامەڵەکردن بە سووەوە هەروەك ئاڵوگۆڕی شمەك و دراو بە کارێکی ئاسایی دەبینێت.

سەروەری هەردوو جیهان(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر زوو ئوممەتەکەی لەو قەیرانە ناهەموارە ئاگادار کردەوە کە لە ئاکامی سووەوە بەرۆکی مرۆڤایەتی دەگرێت و، هۆشیاریی دانێ کە زۆر وریایانە هەڵسوکەوت بکەن و، نەکەونە ناو پەنگاوی سووەوە. بەڵام وەرە ببینە کە وا ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی تاوەکو گەرووی لەنێو زەلکاوی سووخۆریدا تێناوە و وا دیارە هیچ نیازێکیشی نییە

لێی بێتەدەر... ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئیسلام، دینێکە جەنگی دژی سوو ڕاگەیاندووە.[1]

خۆزگە موسوڵمانان، هیچ نەبووایە بەشێکی ئەو دەربڕینە هەڕەشە ئامێزانەی قورئانی پیرۆز لەمەڕ ئەم بابەتە تێبگەیشتنایە و، لەو دەربەدەری و پەرێشانییە ڕزگاریان ببووایە، کە بەهۆی سووخواردنەوە دووچاریان بووە.

## ١١ ـ ئەو دەمەی ئیماندار خۆی دەشارێتەوە

پێغەمبەری ڕەحمەت(ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا، کە ڕەوشی ئەمڕۆمان بە وێنەی تابلۆیەك دەخاتە پێش چاو، دەفەرموێ:

يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَسْتَخْفِي الْمُؤْمِنُ فِيهِمْ كَمَا يَسْتَخْفِي الْمُنَافِقُ فِيكُمُ الْيَوْمَ.[2] " ڕۆژگارێك دادێ بەسەر مەردوومدا، ئیماندار لەناو خەڵکیدا خۆی دەشارێتەوە، هەروەك چۆن ئەمڕۆ مونافیق لەناو ئێوەدا خۆی دەشارێتەوە..."

لەو سەردەمەدا دووڕوو چۆن هەڵسوکەوتی دەکرد؟ چ ڕێگەچارەیەکی دەگرتەبەر بۆئەوەی پێی نەزانن؟ ئیتر بە هەمان شێوە، مرۆڤی باوەڕداریش هەروەك ئەو ڕەفتار دەکات و، ناچار دەبێت خۆی دەرنەخات و پەرستشەکانی

---

١ - ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ (البقرة:٢٧٨-٢٧٩) " ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن. خۆ ئەگەر وانەکەن، ئەوە جەنگ لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکەیدا ڕابگەیەنن (کە سەرئەنجامەکەی زۆر سامناکە)، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و (لە سوو خۆری واز بهێنن) ئەوا تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نە ستەم دەکەن (لە قەرزارەکان) نە ستەمتان لێ دەکرێت."

٢ - الطبراني، مسند الشاميين ١/١٤٨.

بەنهێنی ئەنجام بدات. تا بەشکوم بەم شێوەیە بتوانێت پارێزگاری لەو پێگەیە بکات کە لە کۆمەڵگەدا هەیەتی.. ئەگەرنا ژیانی لێ تاڵ دەکەن. زیهنیەتی ئەم شەڕخوازە زاڵە، جێی کەسانی باوەڕدار و پاك داوێنی تێدا نابێتەوە. ئیتر بەم جۆرە بوارەکانی کارکردن و بەشێك لە پلە و پۆستەکانی دەوڵەت، بەتەواوی بەڕوویاندا دادەخرێن و، لەنێو کۆمەڵگەدا بە چاوێکی سووك و بێ ئەرزشەوە لێیان دەڕوانرێت.

فەرموودەیەکی تریش هەیە جەخت لەسەر هەمان لایەن دەکاتەوە: "فیتنەگەلێکی ئەوتۆ دێنە پێش، وای لێدێت مرۆڤ لەبەر نوێژکردن عەیبدار دەکرێ. هەروەك چۆن ئەمڕۆ ئافرەتی داوێن پیس عەیبدار دەکرێ." [1]

جا کاتێك عەیبدارکردنی ئافرەتی داوێن پیس دەشوبهێنرێت، ئەوا لەسەر بناغەی ڕەچاوکردنی بنەما و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەیە. ئەگەرنا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، ئەم ڕەوشتە قێزەونە نەك هەر بە عەیب و ئابڕوو چوون دانانرێت، بەڵکو بەتایبەتی لە هەندێ ناوچەدا وەك کار و پیشە تەماشا دەکرێت.

جا بەدەر لە ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراو، ئەو ڕۆژانەش دێن کە تیایدا خەڵکی تەنها لەبەرئەوەی نوێژ دەکەن، سووکایەتییان پێدەکرێ و، وەك ئەوەی کارێکی ئابڕووبەریان ئەنجام دابێ، دەستی تۆمەتیان بۆ درێژ دەکرێ و، لەژێر ستەمی هێزە شەڕخوازەکاندا دەناڵێنن. ئیتر لە هەلومەرجێکی وادا، باوەڕداران بە شاردنەوەی ئیمانەکەیان، ئەم بەڵایانە لە خۆیان دوور دەخەنەوە.

---

١- علي المتقي، كنز العمال ١١/١٨٠. (لە "نعيم بن حماد" و "طبراني"یەوە گێڕاویەتەوە.

## ١٢ ـ نەوت لە تالەقان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

وَيْحاً لِلطَّالَقَانِ! فَإِنَّ لِلهِ فِيهِ كُنُوزاً لَيْسَتْ مِنْ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ.[١]

دەستەواژەی "وەیح" لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەو مژدانە بەکاردێت، کە ئاوێتەی بزەیەکی تاڵن. ئەوەتا کاتێك پێغەمبەری خوا هەواڵی شەهید بوونی حەزرەتی عەمماری ڕاگەیاند، هەمان دەستەواژەی بەکارهێنا و، پێی فەرموو: وَيْحَكَ يَا عَمَّارُ.[٢]

هەرچی "تالەقان"یشە، ناوی ناوچەیەکە لە قەزوین، کە بە کێڵگە نەوتییەکانی ناسراوە. کەوابێ ڕاڤەی فەرموودەکە بەم جۆرە دەبێ: " مژدەبێ لە تالەقان، خوای گەورە لەوێدا چەندین گەنجینەی هەیە، کە نە ئاڵتوونن نە زیو."

جا بۆیە لەوانەیە لە داهاتوودا چەندەها کانی کانزایی تر، بە وێنەی یۆرانیۆم یاخود ئەڵماس بدۆزرێنەوە. بەڵام هیچ کام لەمانە ئەنجامەکە ناگۆڕێت، چونکە سەروەرمان(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) باس لە گەنجینەیەك دەکات کە لە ڕەگەزی ئاڵتوون و زیو نییە.. ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئێستا ئەو کانزایانە دۆزراونەتەوە. ئیتر تەنانەت ئەو نەوتەش کە لە تالەقان دەردێت، تەصدیقی پێغەمبەری خوا دەکات و، جاری ڕاستی و دروستییەکەی دەدات...

---

١- علي المتقي، كنز العمال ٥٩١/١٤. ( لە "أبو غنم الكوفي"یەوە گێڕاویەتەوە.)

٢- البخاري، الصلاة ٦٣ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٥/٣.

## ١٣ ـ شوێنکەوتنی ئەهلی کیتاب

جیهانی ئیسلامی هەنگاو بە هەنگاو و بست بە بست شوێن نەتـەوەکانی پێش خۆی، واتە مەسیحی و جوولەکەکان دەکەوێت و، لاسـاییان دەکاتـەوە. تەنانەت ئەگەر یەکێك لەوان سەر بکات بە کـونی بـزن مژەیەکیشـدا، ئـەوا موسوڵمانانیش چاوی لێدەکەن و، سەر دەکـەن بـەو کونـەدا. نـووری دیـدە، سەروەرمان حەزرەتی موحەممەد موسـتەفا(ﷺ) بـەم دەربڕینـە پوخـت و پـڕ واتایەی خوارەوە، ئەم ڕاستییەمان بۆ باس دەکات:

لَتَتَّبِعُنَّ سُنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ شِبْراً بِشِبْرٍ وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لاَتَّبَعْتُمُوهُمْ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: فَمَنْ؟

" بە جۆرێك شوێن نەتەوەکانی پێش خۆتان دەکەون و لاساییان دەکەنەوە، بست بە بست و هەنگاو بە هەنگاو شوێنیان دەکەون. تەنانەت ئەگـەر ئـەوان سەربکەن بە کونی بزن مژەیەکدا، ئێوەش هەمان شت دەکەنەوە."

هاوەڵان پرسییان کە ئایا مەبەست لە ڕستەی " نەتەوەکانی پێش خۆتان " مەسیحی و جوولەکەکانە؟ پێغەمبەری خواش لە وەڵامدا فـەرمووی: " ئـەی ئەبێ کێی تر بێ؟! "[١]

حـاڵی حـازر بـارودۆخی ئێمـە و سـەرجەم جیهـانی ئیسـلامیش لەبـەر چاودایە.. ئەوەتا زۆرێکمان کەسایەتی خۆمان بزر کردووە و دووچاری قەیرانی ناسنامە بووینەتەوە. حاڵمان ـ بەدەربڕینی فەرموودەکە ـ هەروەك حاڵی ئەو مەڕە سەرلێشێواوە وایە، کە لـە نێـوان دوو ڕانـە مـەڕدا هـەر لـە هـات و چووندایە. ئەمە وێڕای ئەوەی سەرجەم ئەو هۆکارە نەرێنی (سـلبی)یانەی کـە

---

١- البخاري، الأنبياء ٥٠ ـ مسلم، العلم ٦.

ڕۆژانێك دەوڵەت و ژیارەكانی تریان ڕووخاند و لەناویان بردن، وا ئەمڕۆ هەروەك ئەختەپووت، لە هەر چوار لاوە ژیانمانی تەنیوون. كەچی ئێمەش بەدەم سەرسامی و چاولێكەرییەوە، وادەزانین ئەم داوی مەرگە شارێگەی نوێگەری و شارستانییەتە. بەڵێ، لە هیچ كام لە سەردەمەكاندا هیچ گەل و نەتەوەیەك، بە ئەندازەی چاولێكەریی ئێمە بۆ خۆرئاوا، ئالوودە و مەراقی چاولێكەری و لاسایی كردنەوە نەبووە. ئەمڕۆ لە جیهانی خۆرئاوادا هەر تازەگەرییەك بێتە مەیدان، بەبێ داواكردنی پەرلەی گوزەربوون (شفرة العبور)، یەكسەر لای ئێمە پەسەند دەكرێ و، لە خێرایی ئەم پەسەند كردنەشماندا پێش زۆرێك لە ولاتە خۆرئاواییەكان كەوتووین. ئەمە لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا، تەنانەت لە وردترین بابەت و ئەو باسانەشدا كە بە لاوەكی دەبینران، پێچەوانەی ئەوان دەجوولایەوە.[1]

جا هەرچۆنێك بێت، نامانەوێت دەرگای ئەم باسە بكەینەوە. چونكە تەوەرەی بابەتەكەمان ئەوە نییە. بەلام ئەو ڕووەی ئێمە دەمانەوێت هەلوێستەی لەسەر بكەین، هەواڵدانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) پێش چەندین سەدە بەر لە ئێستا، لە هەموو ئەو ڕووداوانەی كە لە داهاتوودا ڕوودەدەن. كاتێكیش وادە و وەرزی دیاریكراویان دێت، دەقاودەق وەك خۆیان دەردەكەون. بەڵێ، هەموو ڕووداوەكان لەسەر زاری مویارەكی ئەودا، لەسەر شێوەی مزگێنی و ئاگاداركردنەوە خۆیان پیشان دەدەن. ئنجا كە كاتی دیاریكراو (الوقت المرهون)یان دێ، دەبنە زمانێكی پاراو و شایەتی لەسەر صیدق و ڕاستگۆیی ئەو دەدەن.

---

١- أبو داود، الصلاة ٨٨ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٥/٢٦٤- ٢٦٥.

# سێهەم

# ئەو هەواڵە غەیببیانەی پەیوەندییان بە لقە هەمەجۆرەکانی زانستەوە هەیە

لەم بەشەدا کورتەیەك لەو فەرموودانـەی پێغەمبـەری ئـازیز(ﷺ) بـاس دەکەین، کە دەربارەی لقە جیاوازەکانی زانست فـەرموونی و، دەبنـە بەڵگـە لەسەر ڕاستبێژیی ئەو سەروەرە.

پێغەمبەری خـوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چـوارده ـ پـانزه سـەدە بـەر لـە ئێسـتا وتەیەکی فەرمووە، لەو ڕۆژەشەوە تا ئێستا لقە جۆربەجۆرەکانی زانسـت کـە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی فەرمایشتەکانی ئەون، چـەندین هـەنگاوی گـەورەیان بەرەو پێش ناوە و قۆناغی سەرسوڕهێنیان بڕیوە.. کەچی سەرەنجام دەبینیـت ئەو کەڵە زانایانەی کە هەریەکەیان بە پێشەنگ و شارەزای بوارەکانی خۆیـان دادەنرێن، لەسـەر زمانی زانستەکانیان تەصدیقی ئەو زاتـە دەکـەن و جـەخت لەسەر ڕاست و دروستییەکەی دەکەنەوە. بـەڵێ، تـا ئـەمڕۆ تەنانـەت تاکـە ڕستەیەکیش لە وتەکانی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەمـەڕ ئـەم بابەتـە بـەدرۆ نەخراوەتەوە.

لە لایەکی ترەوە، سەرباری ئەو هەموو ماددەپەرسـتەی کـە سـەریان بـۆ زانست و تەکنەلۆجیا نەوی کردووە و لە خزمەتیدان، کەچی ئـەو (زانسـت و تەکنەلۆجیا) - لەگەڵ ئەو پێشـکەوتنە مەزنەشـیدا- پشـت لـە هـەموویان دەکات و، لە ڕێگەدا بەجێیان دەهێڵێ و ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خوا. ئیتر بە ئەدەب و ڕێزەوە لە بەرامبەر ئەو زاتەدا ملکەچ دەوەستێ و، تـا دەنگـی بـڕ

بکات دەڵێ: " صَدَقْتَ" جا خۆ ڕێی تێنەدەچوو کە بەجۆرێکی تر بووایە، چونکە ئەو نێرراوی حەقی پەروەردگارە.

لێرەدا هەوڵدەدەین هەڵوێستە لەسەر چەند نموونەیەکی هەڵبژێرراو بکەین. توێژینەوەی زانستی بابەتەکەش دەسپێرینە ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی تایبەتن بەو بوارەوە:

### ١ـ هەموو نەخۆشییەك چارەسەری هەیە

لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی بوخاری(ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) دەفەرموێ: مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً إلاَّ أَنْزَلَ بِهِ شِفَاءً.[١] " خوای گەورە نەخۆشییەکی نەناردووە، کە بەدوایدا چارەسەرێکیشی بۆ بەدی نەهێنابێ." واتە، چەند جۆری نەخۆشی هەبێ، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە(سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) شێوازی چارەسەر و تیمار کردنیشی بۆ دروستکردووە. هەمەکیترین و گشتگیرترین وتەیەك لە دنیای پزیشکیدا و لە ڕووگەی هاندانی زانستخوازییەوە تا ئەمڕۆ وترابێت، دەبێت ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا بێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر نەخۆشییەك هەبێت، بێگومان چارەسەرەکەشی هەیە. کەوابێ، ڕۆژێك لە ڕۆژان ـ بە پشتیوانی و کۆمەکی پەروەردگار ـ بە حەتمی دەتوانرێ دەرمانی هەموو دەردەکان بدۆزرێنەوە.

ڕیوایەتێکی تری فەرموودەکە بەم جۆرەیە: لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ.[٢] " هەموو دەردێك، دەرمانی هەیە."

لە فەرموودەیەکی دیکەشدا هاتووە کە:

---

١- البخاري، الطب ١ ـ إبن ماجة، الطب ١.
٢- مسلم، السلام ٦٩ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٣٣٥/٣.

تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ: اَلْهَرَمُ.[١]

" ئاگادار بن، کەمتەرخەمی نەکەن لە تیمارکردندا. خوای گەورە دەردێکی ناردبێ، ئەوا بەدڵنیاییەوە بەدوایدا ڕێگەی چارەسەریشی پیشانداوە. تەنها یەك نەخۆشی هەیە چارەسەری نەبێ، ئەویش پیربوونە."

خۆ ئەگەر ڕێگەچارەی درێژکردنەوەی ژیانیش بدۆزنەوە، یاخود بۆ ماوەیەکی کاتی تەمەنی مرۆڤەکان لە ئاستێکی دیاریکراویشدا بوەستێنن، بگرە ئەگەر مردنیش دوا بخەن، ئەوا دیسان دەستەوسان دەبن لەوەی کە گەشتی تەقدیرکراوی قافڵەی مرۆڤایەتی بوەستێنن. ئەو ڕێگایەی کە لە جیهانی ڕۆحەوە دەست پێدەکات و بە قۆناغی منداڵی و لاوی و پیریدا گوزەر دەکا و، سەرەنجام بەگۆڕدا تێپەڕ دەبێ و لەوێشەوە تا حەشر درێژ دەبێتەوە.. پاشان بەردەوام دەبێ تاکو لە بەهەشت یان دۆزەخدا کۆتایی پێدێت... بەرگرتنیش بەم ڕێگایە هەرگیز مومکین نییە. ئەوەتا مرۆڤەکان دێنە دنیاوە و گەورە دەبن و پاشان پیر دەبن، لەپاش پیربوونیشیان دەمرن. ئیتر جگە لەمە، هەموو دەرد و نەخۆشییەکانی تر چارەیان هەیە، ئەوەندە بەسە کە توێژینەوە بکرێ و بدۆزرێتەوە...

فەخری کائینات(عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) بەم دەربڕینە و هاوشێوەکانی ئەمە، تەواوی مرۆڤایەتی بۆ توێژینەوەی زانستی هاندەدات و، بانگهێشتی سەرجەم زانایان و لێکۆڵەرەوان و، تێکڕای ئەو "مُلْهَمُون"ەش دەکات کە بەهرەمەندی ئیلهامن، بۆ گەڕان بەدوای چارەسەردا:

---

١- أبو داود، الطب ١ - الترمذي، الطب ٢ - إبن ماجة، الطب ١.

بەشێك لە بودجەكانتان تەرخان بكەن بۆ بونیاتنانی ناوەندی توێژینەوەی زانستی. تاوەكو ئەو مەنزڵەی دەگاتە كەناری مردن، بڕۆن و هەرچۆنێك بووە ئەو گۆڕەپانە فراوانەی كە تا ئەو سنووره درێژ دەبێتەوە، بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆتانەوە.

جا خۆ قورئانی پیرۆزیش هەردەم ڕێنماییەكانی لەم بوارەدا چڕكردووەتەوە. ئەوەتا كاتێك تاسە و خولیای زانستخوازیی لە مرۆڤەكاندا دەبزوێنێت، موعجیزەی پێغەمبەرانیان دەخاتە پێش چاو. بەخستنە ڕووی ئەو موعجیزانەش، ئەو كۆتا سنوور و دوایەمین مەنزڵە دیاریدەكات، كە لێكۆڵینەوە و دۆزینەوەكان پێی دەگەن. بەڵێ، جا هەروەك چۆن پێغەمبەران(عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ) لە ڕۆحیانەت و ژیانی مەعنەویدا بوونە ڕابەر و پێشەوای مرۆڤایەتی و، لە ڕێگا خوار و خێچەكانەوە بەرەو كەنارە ڕاست و سەلامەتەكان ئاراستەیان كردن، هەر بەو شێوەیەش لە زانستە ئەزموونییەكاندا، واتە لەو زانستانەشدا كە مایەی ڕۆشنایی عەقڵ و ژیرین، ڕێبەرایەتی كردنی گرۆی ئادەمیزادیان گرتە ئەستۆ و، هەر یەكێكیان وەك شارەزا و پسپۆڕی بوارێك، پێشیان كەوتن و ڕێگەیان پیشاندان. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین مرۆڤایەتی كلیلی سەرجەم پێشكەوتنە ماددی و مەعنەوییەكانی لە پێغەمبەرانەوە وەرگرتووە. بەڵێ، مەبەست لە باسكردنی موعجیزەی پێغەمبەران لە قورئاندا، لەپێناو هاندان و تاسە بزوێنیی ئێمەی مرۆڤە بۆ گەیشتن بەو سنوورەی موعجیزەكان كە ڕێگەمان دراوە پێی بگەین.

بۆ نموونە: حەزرەتی مەسیح ـ بە ئیزنی خوا ـ مردووی زیندوو كردووەتەوە. قورئانی پیرۆزیش ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین كە ئەوە كۆتا سنوورە و، پێشكەوتنی مرۆڤ لەو ئاستەدا كۆتایی دێت. بۆچی؟ ئاخر چونكە لەوێدا كارە ئاساییەكان (العاديات) تەواو دەبن و، ئیتر

لەودیو ئەو سنوورەوە، کارە دەرئاساکان (الخوارق) دەست پێدەکەن. توانستی ئادەمیزاد و ئەو کارانەش کە بە ئیرادەی مرۆڤ دەتوانرێ بکرێن، ناتوانن لە چوارچێوەی یاسا فیترییەکان (ئەو یاسا باوانەی لە گەردووندا بەکارن) بترازێن. بەڵێ، داهێنانە سەرسوڕهێن و ناوازەکانی زانست و تەکنەلۆجیا بگەنە هەر ئاستێك، هێشتا کۆڵەوارن لەوەی سنوورەکانی پەرجو (المعجزة) تێپەڕ بکەن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو سنوورانە، کایە و گۆڕەپانی ئەنبیائی عیزامن و، تا ئەبەدیش هەروا دەمێننەوە. بەڵێ، ئەوە تەنها پێغەمبەرانن کە دەتوانن لەو کایانەدا بجووڵێنەوە. ئیتر لەمدیوی ئەمەوە و، تا ئەو سنوورەی موعجیزەکان دەست پێدەکەن، پێشکەوتن و قۆناغبڕیی ئادەمیزاد هەموو کات مومکینە. جا خۆ هەموو ئەو هاندانانەش هەر لەبەر ئەمەیە.

ئیتر ئەوەتا دەبینی قورئانی پیرۆز، بە موعجیزەکەی حەزرەتی مەسیح(عليه السلام) گیانی شەوق و تاسە دەکا بە بەرماندا و پێمان دەڵێ: ڕێگاکانی چارەسەر و هەتوان، هەتا سنوورەکانی مردن کراوەن.. تەنانەت ئەو نەخۆشییانەش کە تا ئێستا چارەسەریان بۆ نەدۆزراوەتەوە، وەك شێرپەنجە و ئایدز، چارەیەکیان هەر هەیە. بەدوایدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە. تەنانەت هەندێك لەو نەخۆشییانەی کە پێشتر وا دەبینران چارەسەریان نییە، وا ئەمڕۆ بە ئاسانی چارەسەر دەکرێن. جا ئەگەر چاکی هەوڵ و گەڕانی لێبکەن بەلادا، ئەوا چارەسەری ئەو نەخۆشییانەش دەدۆزنەوە...

هەروەها ئەو موعجیزەیەش کە بەدەستی حەزرەتی موسا(عليه السلام) پێشکەشی مرۆڤایەتی کرا، ئەو وانەیەمان فێردەکات کە دەتوانرێت بۆ گیانەکان ڕامبکرێن بۆ بەجێهێنانی کۆمەڵە ئەرك و فەرمانێك.. بەڵێ، لەم سەردەمەدا ئەم دەرگایە خراوەتە سەر پشت. بەڵام نە ئەمڕۆ و نە سبەینێش، هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت گۆچانەکەی دەستی فڕێبدات و لەسەر شێوەی مارێکی ڕاستەقینەدا

بیبینێت. چونکە ئەوە ڕووداوێکە لە دنیای کارە دەرئاساکاندا بەڕێوە دەچێت. ئەوەش کە لە توانای ئێمەی ئادەمیزاددایە، تەنها ئەو شتانەیە کە لە چوارچێوەی یاسا باوەکانی گەردووندا خۆیان دەبیننەوە.

جێی خۆیەتی لێرەدا باسێك لە قورئانی پیرۆزیش بکەین. ئەو قورئانەی کە موعجیزەیەکی بێ وێنەیە و هیچ توانستێك پێی ناگاتەوە. بەڵێ، قورئانی پیرۆز هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، دوایەمین ئاسۆی هزری ئەدەبییە و، پێگەیشتنەوەی مەحاڵە. ئەو وتە و داڕشتنە وێژەییانەی کە لە بەرزترین ئاستی ئەدەبی و هۆنینەوەدان و، ئەو دەربڕینانەش کە مرۆڤەکانیان ڕاپێچی دوای خۆیان کردووە، ڕۆژێك دێت تا بەر دەرگای قورئانی پیرۆز نزیك دەبنەوە، بەڵام ئیتر لەوێدا هەروەك "لەبید"[1] دەگەنە ئاسۆی سەرسام بوون و دەچەقن. چونکە قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی ناوازەیە لە گوفتاردا. جا بۆیە گوفتار و ئاخاوتنە مرۆییەکان هەرچەندێکیش قەشەنگ و کاریگەر بن، هێشتا هەر لە چوارچێوەی کاروبارە باو و ئاساییەکان دەرناچن.

جا لەبەرئەوەی ئەم باسە بابەتێکی تەواو جیاواز و سەربەخۆیە، ئەوا ـ بێ ئەوەی ئاماژەشی بۆ بکەین ـ دەستی لێ هەڵدەگرین و، بەجێی دەهێڵین بۆ ئەو بەشەی تایبەتە بەم باسەوە.

هەروەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، موعجیزەی پێغەمبەران(ﷺ) وەك بڵێی سنوورێکی دیاریکراو پێك دەهێنن و ئاسۆی زانستە ئادەمییەکان دەکێشن.. لە هەمان کاتدا باسکرانیشیان لە قورئانی پیرۆزدا، ئەرکی هاندان

١- ناوی "لبید بن ربیعة"یە. لە شاعیرە بەناوبانگەکانی سەردەمی جاهیلییە و یەکێکە لە شاعیرانی "المعلقات". بە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتووە و موسوڵمان بووە. پاش موسوڵمان بوونیشی جگە لە بەیتێك هیچ شیعرێکی تری نەوتووە.

و تاسە جوولاندنی مرۆڤەکان بەجێ دەهێنن. ئیتر دوای ئەمە، بۆ هەوڵ و کۆششی مرۆڤەکان بەجێ دەهێلرێت.[1]

پێویستە مرۆڤ هەوڵ بدات بگاتە ئەو خاڵە و، لە بازنەی باو و ڕێسا ئاساییەکاندا، هەموو شتێك تەی بکات و، لە هەوڵی نزیك بوونەوەدا بێت لە سنووری جیهانی دەرئاساکان. بە ڕادەیەك کە ئەگەر - گریمان- هەنگاوێکی تری لەمدیو ئەو سنوورەشەوە نا، بتوانێت بەو ئاسۆیانەدا گوزەر بکات کە بەروبوومی موعجیزەکانی پێدا شۆڕبوونەتەوە.

بۆ نموونە، مرۆڤ لە گۆڕەپانی زانستی پزیشکیدا تا ئەو ئاستەی دەگاتە مردن، دەتوانێت پێشکەوتن تۆمار بکات. بەلام کە دێتە سەر مردن، ئەوە شتێکە چارەسەری نییە. چونکە مردنیش هەروەك ژیان مەخلوقێکی خوای گەورەیە. ئایەتی: ﴿خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَیَوٰةَ﴾ (الملك:٢) " هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە." ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە دەکات.

بەڵێ، مردن لەناوچوون و داڕزان و کوژانەوە و هەڵوەشانەوە نییە. بەڵکو بە ئەمر و ویستی پەروەردگار، بریتییە لە وەرگرتنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە تا ئەو ڕۆژە بە ئەمانەت ڕاسپاردە کرابوون. ئیتر هاندانی زانستەکان هەر تا ئەم ڕاددەیە دەبێت. هەربۆیە ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە سەرشانی هەموو غیرەتمەندان و هیممەت بلندان، ئەوەیە کە گوێ بدەنە ئەم هاندانە و، پشکی خۆیانی لێ وەربگرن و، دوای توێژینەوە و هەڵسەنگاندن بیخەنە خزمەت و سوودی مرڤایەتییەوە.

پێغەمبەری سەرووەرمان(عَلَیۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) سەبارەت بە زانستی پزیشکی، بەتایبەتی دەربارەی هۆشیاری تەندروستی کە بە پزیشکیی خۆپارێزی (الطب

---

١ - بۆ درێژەی زیاتر بڕوانە: کتێبی وتەکان، وتەی بیستەم، مەقامی دووهەم، پێشەکی.

الوقـائي) ناودەبرێت، چەندین فەرموودەی فـەرمووە. ئاشـكرایە ئـەم بابەتـە پانتاییەكی فراوانی لە زانستی پزیشكیدا گرتووە، هەر دەشبێ وابێ. چـونكە گرنگترین شت ئەوەیە كە تاك لە نەخۆش كەوتن بپارێزیت، ئەمەش تـا بڵێـی كارێكی ئاسانە. بەڵام پاش تووشبوون بە نەخۆشی، چارەسەر زەحمەت و گران دەبێ. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەتادا گرنگی بەم لایەنە داوە و، ئەم بابەتە (پزیشكیی خۆپارێزی)ی كردووەتە چەقی زۆرینەی ڕێنماییە پزیشكییەكانی.

هـیچ جێگـەی سەرسـوڕمان نییـە كاتێـك لـە عەصـری سـەعادەتدا پزیشكەكان، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەرەوە دەهاتن بۆ مەدینەی مونەووەرە، كاریان دەست نەدەكەوت. گرنگترین هۆكاری ئەمەش دەگەڕایـەوە بـۆ تـەواو ڕەچاوكردنی ئەو دەستوورانەی كە پێغەمبەری خوا لەمبارەیەوە دایانابوون.

حەزرەتی رسول الله(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەگەڵ ئەوەشدا كە "طبیب القلـوب" بوو و سـارێژی دڵ و دەروونـەكانی دەكـرد، لـە هـەمان كاتیشـدا لـە ڕووی جەستەیشەوە وەك بلێیی پزیشكیی دەكـرد و، چـەندان ڕێوشـوێنی دەگرتەبـەر لەپێناو پاراستنی مرۆڤەكانی دەوروبـەری لـە هـەموو دەردێكـی مـاددی و مەعنەوی.

لەو سـەردەمانەدا "تـاعون" نەخۆشـییەكی سـامناكی ئـەوتۆ بـوو كـە نەدەتوانرا بەری پێبگیرێت. لەم سەردەمەی خۆماندا ئایدز چی بێت، تاعونیش ئەو سەردەمە ئەوە بووە. جا بۆیە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) لە بەرامبـەر ئـەم نەخۆشییە ترسناكەدا زۆر هەسـتیار و خۆپـارێز بـوون. چـونكە سـەروەرمان بەردەوام لەم پەتایە ئاگاداری دەكردنەوە و هۆشیاری دەدانێ. ئیتر ئەم كۆمەڵە نوورانییە، لەناو خۆیانـدا بـە پاكـژی و بێگـەردی خۆیانـەوە دەژیـان. بـەڵام هاوكات لەگەڵ هەڵمەتە سـەربازییەكاندا بـەرەو شـام و ئـەنتاكیا، ئـەوانیش تووشی ئەو پـەتا كوشـندەیە بـوون كـە لـە ژینگـە پـیس و پەتاسێنەكەی

ڕۆمەکاندا هاتبووە ئاراوە. پەتاکەی "عەمواس"یش پەتایەکی لەم جۆرە بوو، کە بە هۆیەوە سی هەزار صەحابی لەو دەڤەرە شوومەدا شەهید بوون.[1]

لەو ڕۆژەدا، ئەمینی ئوممەت "ئەبوو عوبەیدەی جەرڕاح"یش لەنێو ئەوانەدا بوو کە لە عەمواس بوون. ئەو ئەبوو عوبەیدەیەی کە حەزرەتی عومەر چەندین ساڵ دواتر کاتێك بە هۆی پێکانەکەیەوە کەوتە سەر جێگا، دەربارەی فەرمووی: " ئەگەر ئەبوو عوبەیدە لە ژیاندا بووایە، ئەوا ئەوم لە جێگەی خۆم پێشنیاز دەکرد بۆ خەلافەت." [2]

کاتێکیش شاندی نەجرانیەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و، داوایان لێکرد کە کەسێکی ئەمین و متمانە پێکراویان لەگەڵدا بنێرێ، ڕووی موبارەکی کردە ئەبوو عوبەیدە و، فەرمووی: " هەستە لەگەڵیان بڕۆ." [3]

بەڵێ ئەو، ئەمینی ئوممەت و یەکێك بوو لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو. ئیدی ئەو ڕۆژە، ئەم صەحابییە بەڕێزەش لەو ناوچەیەدا بوو، کە پەتای تاعون گیانی مرۆڤەکانی دروێنە دەکرد.

ئەم بەسەرهاتە لە ڕۆژەکانی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ڕوویدا. خەلیفەی پێغەمبەری خوا سەردانی ناوچە فەتح کراوەکانی دەکرد و، لە نزیکەوە چاودێری پێشهاتەکانی دەکرد. نیازی بوو سەردانی عەمواسیش بکات. بەڵام کاتێك بیستی پەتای تاعون لەو ناوچەیەدا بڵاوبووەتەوە، بڕیاری گەڕانەوەی دا. لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا، ئەبوو عوبەیدە پێشی لێگرت و، پێی وت: " ئەی عومەر، مەگەر لە قەدەری خوا هەڵدێیت؟ " حەزرەتی

---

١- إبن كثير، البداية و النهاية ٩٣/٧.
٢- إبن كثير، تفسير القرآن العظيم ٣٣٠/٤ ـ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ٥٨٠/٢.
٣- البخاري، فضائل أصحاب النبي ٢١ ـ مسلم، فضائل الصحابة ٥٤-٥٥.

عومەریش لە وەڵامدا فەرمووی: " بەڵێ، لە قەدەری خواوە، بەرەو قەدەری خوا هەڵدێم." لە ڕاستیدا ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکانی فیراسەتی حەزرەتی عومەر.

داخۆ کارێکی دروستی کردبوو؟ ئایا بە گەڕانەوەی پێکابووی؟ جا کاتێک حەزرەتی عومەر لە بیری ئەم گومانانەدا بوو، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف گەیشت بە هانایەوە و، ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕایەوە:

إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ.[1]

" ئەگەر بیستتان لە شوێنێکدا تاعون بڵاوبووەتەوە، ئەوا نەکەن بچن بۆ ئەو شوێنە. وە ئەگەر لەو شوێنەی ئێوەی لێبوون ئەم پەتایە سەری هەڵدا، ئەوا لە تاو ئەوەی لێی هەڵبێن ، مەیەنە دەرەوە."

تکا دەکەم ئایا ئەمە هەر ئەو ڕێوشوێنە نییە کە پزیشکیی هاوچەرخ ناوی پەرژینی تەندروستی لێناوە؟ جا هەروەك دەبینن، چەندین سەدە لەمەوپێش پێغەمبەری خوا(صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەمەی فەرمووە و، زانستی پزیشکیی ئەمڕۆش تەصدیقی دەکات و، دەڵێ: " ڕاستت فەرمووە."

## ٢ ـ دەردی گولی و پەرژینی تەندروستی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا، کە هەردوو پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و بوخاری دەیگێڕنەوە دەفەرموێ: فِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ

١ - البخاري، الطب ٣٠ ـ مسلم، السلام ٩٨.

الْأَسَدِ.[1] " هەروەك لە شێر هەڵدێیت، ئاواش لە کەسێك تووشی گولی بوویێت، هەڵبێ."

ئـەو دەربڕینـە چـوێنراوەی لـە فـەرموودە پیرۆزەکـەدا هـاتووە، هـیچ پەیوەندییەکی نە بە میکرۆبی گولییەوە هەیە، نە بەوەشەوە کە مرۆڤی گـول لە شێر بچێت، وەك هەندێك کەس وا گومان دەبـەن. پـێم وایـە وەك زۆرێـك مەسەلەی تر، ئەم لێکچوواندنانە (تشبيهات) کۆمەڵـە هەڵبەسـتراوێکن لـە لایـەن کەسـانی تـرەوە بەرهـەم دەهێنـرێن. ئەگـەرنا ڕەچـاوکردنی نیـاز و مەبەستێکی لەم جۆرە لە دەربڕینەکانی پێغەمبەری خوادا، هـەرگیز شـایانی باس نییە.

نابێت ئەو هەڵهاتنەی لە فەرموودەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، وا تێبگەین کە مەبەستی ئەوە بێت کابرا کەوشـەکانی بخاتـە بـن بـاڵی و ڕابکـات. بـەڵکو لەوانەیە پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) لە ڕێگەی ئەم فەرموودەیەوە ئامۆژگاریـان بکات کە بەرەنگاری ئەو نەخۆشییە ببینەوە کە بە گولی ناودەبرێ و، بەدووی ڕێگەچارەکانی خۆپارێزیدا بگەڕێن. واتە ئەوەی ئامۆژگاری لـەبارەوە کـراوە، بریتییە لە پەرژینی تەندروستی و جمانـدن (التحشـيد) دژی تووشـبوون بـەو پەتایە. جا مرۆڤەکان لە بابەتی ڕووبەڕووبوونەوەی شێردا چەندە هەستیاری بنوێنن، پێویستە لە بەرامبەر گولیشەوە ئەوەندە وریا و هەستیار بن. چونکە سەرجەم گوفتارەکانی پێغەمبەری خوا دارای ڕەهەند و قوڵاییـەکی تایبـەتن. بەڵێ، بە هەوڵ و کۆششـێکی زۆر جـددی نـەبێت، مـرۆڤ ناتوانێـت دەرکـی حەقیقەتی فەرمایشتەکانی ئەو زاتە بکات.

---

١ - البخاري، الطب ١٩ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ٤٤٣/٢.

## ٣ ـ دەم و لیکی سەگ

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە:

طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ أُولاَهُنَّ بِالتُّرَابِ.[١]

" ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری هەر یەکێکتانەوە، ئەوا پاکژییەکەی بەوە دەبێت کە حەوت جار بیشوات، یەکەم جاریشیان بە گڵ."

ئەو کەرەستە و ماددانەی کە ئەمڕۆ لە بواری پاکژکردنەوە(تعقیم)دا بەکاریان دەهێنین، لەو سەردەمەدا بوونیان نەبووە. ئیتر لەو ڕۆژگارەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە مەبەستی پاکژکاریی دژە میکرۆب، بەزۆری ئامۆژگاری بەکارهێنانی گڵی دەکرد. ئنجا دواتر و لەئەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا دەرکەوت کە گڵیش هەر وەك ئاو، کرداری پاکژکردنەوە ئەنجام دەدات. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە گڵ هەردوو ماددەی "تەترالیت" و "تێتراسایکلین"ی تێدایە، کە بۆ لەناوبردنی کۆمەڵە میکرۆبێك بەکاردێن. جا کاتێك پێغەمبەری خوا ڕێنمایی بەکارهێنانی گڵ دەکات بۆ شوشتن، مەبەستی ئەوەیە کە پێویستە سەرەتا کەرەستەکە تەعقیم بکرێت.

جگە لەم واتایانەی سەرەوە، فەرموودە پیرۆزەکە سەرنجمان بۆ ئەم لایەنانەش ڕادەکێشێت:

یەکەم: کۆمەڵە نەخۆشییەك کە لەوانەیە لە سەگدا بوونیان هەبێ، ئەگەری ئەوەی هەیە لە جەستەی مرۆڤیشدا ژینگەی لەباریان بۆ بڕەخسێ. ئەمەش بە یەکێك لە بابەتە هەنووکەییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆ دادەنرێ.

---

١- مسلم، الطهارة ٨٩-٩٣ ـ الترمذي، الطهارة ٦٨.

دووهەم: ئەو شتانەی کە وەك پاشەڕۆی سەگ وان، دەکرێ بەتەواوەتی زیانیان هەبێت بۆ تەندروستی مرۆڤ، لیکەکەشی هەروا... خۆ ئەگەر لە کاتی خۆیدا ڕێ و شوێنی پێویست نەگیرێتە بەر، ئەوا پێشگرتن لەو نەخۆشییەی کە لەوانەوە دەگوازرێتەوە، دەبێتە کارێکی مەحاڵ. هەربۆیە تەعقیم کردن گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە.

سێهەم: لایەنێکی دیکەی سەرنج ڕاکێش لەوەدا کە دەبێت یەکەم شوشتن بە گڵ بێت، بریتییە لەوەی کە گڵەکە لەو ساتەدا دەگۆڕێت بۆ میکرۆبێکی پاکژکەر (مُعَقِّمْ) و ئیتر پێویستە ئەویش شەش جار ـ لە ڕیوایەتێکی تردا حەوت جار ـ بشۆررێت. تەنانەت ئەم بابەتە ببووە سەرباسی هەندێك لە بڵاوکراوە ئەڵمانی و بەریتانییەکان. بەم جۆرە ڕاستبێژی و دروستیی فەرمایشتەکانی سەروەرمان(عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەلایەن ئەوانیشەوە تەصدیق دەکرێن.

پێغەمبەری خوا لەبەرامبەر سەگدا هێندە هەستیار بوو، تەنانەت جارێکیان بەگوێرەی ئیجتیهادی خۆی فەرمانی کوشتنیشی دان.[١] بەڵام دواتر ئەم فەرمانەی وەستاند و، فەرمووی: " ئەگەر سەگەکان بەتەنها خۆیان ئوممەتێك نەبوونایە، ئەوا فەرمانم دەدا بە کوشتنیان." [٢]

واتای ئەمەش ئەوەیە: ئەگەر سەگەکانیش بە وێنەی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی تری وەك ئادەمیزاد و ڕووەکەکان و بێگیانەکان و هتد...، ڕەگەزێك نەبوونایە لە ڕەگەزەکانی پاراستنی هاوسەنگیی ژینگەیی (التوازن البيئي)، هەروەها بەگوێرەی ڕێسا گەردوونی و سروشتییەکان (الشَريعة

---

١- البخاري، بدء الخلق ١٧ ـ مسلم، الطهارة ٩٣.
٢- الترمذي، الصيد ١٦ ـ أبو داود، الأضاحي ٢١ ـ الطهارة ٣٧.

الفِطْرِيـة) زەرووڕەتێك نەبووایە لە بوونیاندا، ئەوا ئـەوكات فـەرمانم دەدا بـە لەناوبردنیان. چونكە سەگ سەرچاوە و لانكەی میكرۆبە...

ڕوانینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ بابەتەكە لە ڕوانگـەی ئـەم هەڵوێستـەی دواییەوە، خۆی لە خۆیدا موعجیزەیەكی ترە.. ئەوەتا دەبیـنین ئـەو ڕێسـا و هاوسەنگییە ژینگەییەی كە لە سروشتدا كارایە و ئێمە خەریكە تازە بـەتازە حونجەی دەكـەین، هـەر لـەو كاتـەوە بایـەخی پێـدراوە و، لەسـەر بنـەمای نەكوشتنی بەهەوەنتەیی سەگەكان باسی لێوە دەكـرێ و دەكرێـت بـە یاسـا. ئێمەش پاش ١٤٠٠ سـاڵ ئینجـا خەریكـە وردە وردە دەرك بـە زەرووڕەتـی ڕێگرتن لە قڕتێكەوتنی (إنْقِراض)ی وەچەی گیانلەبەرانی وەك نەهەنگ و فیل و كەركەدەنـەكان دەكـەین، كـە تێكچـوونی هاوسـەنگیی نـاو سروشـتیان لێدەكەوێتەوە. جا كاتێـك پێغەمبـەری خـوا پـێش هـەزار و ئەوەنـدە سـاڵ دەفەرموێ: " ئەگەر سەگەكان بەتەنها خۆیان ئوممەتێك نەبوونایە..." ئەوا لـە سەردەمێكی زۆر پێشوەختەوە، بابەتێكی زۆر گرنگمان وەبیر دێنێتەوە.

بەڵێ، خوای گەورە(عَزَّوَجَلَّ) گەردوونی بـەدی هێنـاوە و، هاوسـەنگییەكی گشتیشی لەنێوان ئەو توخم و ماكانەدا هێناوەتە ئاراوە كە ئەم گەردوونـەیان پێكهێنـاوە. ئـەم ئـایەتە پـیرۆزەش:﴿وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ۝ أَلَّا تَطْغَوْاْ فِى ٱلْمِيزَانِ﴾ (الرحمن: ٧ – ٨) " تەرازوو و پێوەری بۆ هەموو شتێك داناوە. بۆیـە ئێوەش ئەم هاوسەنگییە تێك مەدەن." ئامـاژە بـۆ ئـەم بنـەما هەمەكییـە دەكات. بەڵێ، پێغەمبـەری خـوا مـەردی هاوسـەنگی بـوو. هەڵبەتـە كـە هاوسـەنگی دەپاراسـت و ـ بەدەربڕینەكـەی سـەرەوەی ـ قەڵاچـۆی سـەگی نەدەكرد. بە تەنها لـەو ڕسـتە چـەند وشـەییەی سـەرەوەدا توانیمـان چـەند لایەنێكی موعجیزەیی تۆمار بكەین، بەڵام كێ دەزانێ لە داهاتوودا هـەمان

ڕستە دەبێتە ئیلهامی چەند حەقیقەت؟! خۆ ئەگەر هەر کەسێکی تر - بە ڕەچاوکردنی مێژووی دەربڕینی ئەم وتەیە - بەدرێژایی هەموو ژیانی لە بیرکردنەوەدا بووایە و تەنها ئەم تاکە ڕستەیەی بووتایە، ئەوا ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی بیخەینە ڕیزی زانا و بلیمەتەکانەوە. کەچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم فەرموودەیە و هەزارەهای تری وەك ئەمەی فەرمووە. ئێستاش با لێگەڕێین بلیمەتی لە دەرگانەی ئەو سەروەرەدا خەریکی سواڵکردن بێ و، ئێمەش کۆتایی بەم بڕگەیە بهێنین:

زۆر بە ڕوونی و بەبێ هیچ دوودڵییەك دەڵێین: بەسەرهات و ڕووداوەکان، هەمیشە و هەردەم بە زمانی تایبەتی خۆیان تەصدیقی پێغەمبەری خوا دەکەن و دووپاتی دەکەنەوە کە: " تۆ پێغەمبەری خوایت و، هەمووکات ڕاستگۆ و دروستیت." جا ئێمە گومانمان لەوەدا نییە کە تا هۆشیاریی زانستی بەرەو پێش بچێ، ڕۆژێك دێ مرۆڤەکانیش هەمان قسە دووبارە بکەنەوە. بەڵێ، ئەمڕۆ زانستەکان، هەریەکەیان وەك سیخوڕێك بەناو بوونەوەراندا ڕۆچوون و، سەرگەرمی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی ئەو ڕاستییانەن کە قورئان و سوننەت باسیان کردوون. لەژێر ڕۆشنایی ئەم لێکۆڵینەوانەشدا، ئەو ڕۆحە هەستیارانەی کە بەڕووی حەقیقەتدا بێدارن، ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕاستی و دروستی پێغەمبەری خوایان ڕوونتر بۆ دەردەکەوێت و، بە زمانێکی زوڵاڵتر دەیدەن بەگوێی جیهاندا...

## ٤ - دەست شتن لە پێش و پاشی خواردن

لە فەرموودەیەکدا کە تیرمذی و ئەبو داوود ڕیوایەتیان کردووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ.[1] " بەرەكەتی (موبارەك بوونی) خواردن، لە شۆردنی دەستەكاندایە لە پێش نان خواردن و لە پاشیشیدا."

واتــە ئەگــەر لــە خواردنەكانتانــدا بــەدوای موبــارەكیی و پاكوخاوێنیــدا دەگەڕێن و حەز دەكەن ئەو خواردنەی دەیخۆن ببێتە مایەی بەرەكـەت بۆتـان، ئەوا هەم لە پێش و هەم لە پاش تـەواو بوونیشـدا ، وەك ئـەوەی دەسـتنوێژ بگرن، دەستەكانتان بشۆن.

پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەم وتانەی بنەما و بناغەیەك بۆ پاكـژیی دادەڕێژێت. ئەگەرنا ئێمە بە عــەقڵی خۆمــان دەركــی ئەمانــەمان نــەدەكرد. نەخاسمە مرۆڤی ئەو سەردەمە، هەرگیز بیری بەلای ئەوەدا نەدەچوو كە دەكرێ لەنێو نینۆكێكدا ملیۆنەها میكرۆب خۆیان مەڵاس دابێت. تۆ واز لە خەڵكی ئەو كاتە بهێنە، هــەر لــەم ســەردەمەی خۆمانــدا چــەند كــەس هەیــە ڕووی زانستیی ئەم بابەتە بزانێ؟..

دیسان سەبارەت بە پاكوخاوێنی، پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریمان دەكات كە كاتێك لە خەو هەڵدەستین، یەكسەر دەست نەبەین بۆ خواردن، بەڵكو پێویستە سەرەتا دەستەكان جوان بشۆرڕێن، چونكە مرۆڤ نازانێــت كاتێــك لــە خــەودا بــووە، دەســتی لــە كوێــدا بــووە و بــەر چــی كــەوتووە.[2] هــەروەك دەبیــنن، پێغەمبەر(ﷺ) پاكۆی دەستەكان دەخاتە پێش چــاو و بــە بایەخــەوە جــەختی لەسەر دەكاتەوە.

پزیشكەكان مەگەر لەمڕۆدا توانیبێتیان بە تەواوی لەم مەسەلەیە تێبگەن و بۆ خەڵكیشی ڕوونبكەنەوە. بەڵێ، مرۆڤ لە كاتی نووستندا دەستی بــەملاو

---

١ - أبو داود، الأطعمة ١١ ـ الترمذي، الأطعمة ٣٩.

٢ - البخاري، الوضوء ٢٦ ـ مسلم، الطهارة ٨٧-٨٨.

ئەولادا دەگێڕێ و بێ ئەوەی ئاگاشی لێبێ، دەستی میکرۆباوی دەبێ. ئنجا کاتێك بێ دەست شتن دەست دەبا بۆ دەمی، ئەوا ڕوونە کە چی قووت دەدات...

جا مەگەر لەو سەردەمەدا مایکرۆسکۆب و تیشکی ئێکس و تاقیگەی شیکاری هەبوون، تا پێغەمبەری خوا ئوممەتەکەی لەو میکرۆبانە ئاگاداربکاتەوە کە دەستی مرۆڤ پیس دەکەن؟! نەخێر، هیچ کام لەمانە بوونیان نەبووە. بەڵام لەودیو هەموو ئەمانەوە، حەقیقەتێك بوونی هەبوو، ئەویش مەوجودییەتی ئەو زاتە بوو، کە لە ڕێگەی درێژە شەپۆلە جۆراوجۆرەکانی وەحییەوە، سەرجەم ئەمانەی فێردەکرد.. بەڵێ، ئەو هەمیشە لەلایەن موعەللیمی ئەکبەرەوە، جا لە ڕێگەی "الوحي المتلو"وە بێت یان "الوحي غير المتلو"وە، فێردەکرا، ئیتر ئەویش ئوممەتەکەیی فێردەکرد و تەبلیغی دەکردن.. هەر بۆیە مەحاڵە لە فەرمایشتە پیرۆزەکانیدا هێندەی تۆسقاڵێك هەڵبەستن و ناڕاستی بەرچاو بکەوێت.

### ٥ـ پاك و خاوێنی دەم و ددان (سیواك)

لە حەدیسێکی موتەواتیردا کە لە " کوتووبی سیتتە"دا بەکۆی دەنگ ڕیوایەت کراوە و، ئیمزای نزیکەی چل صەحابی هەڵگرتووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ.[1] " ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە بارگرانی دەخەمە سەرشانی ئوممەتەکەم، ئەوا فەرمانم پێ دەدان پێش هەموو نوێژێك سیواك بکەن."

---

١- البخاري، الجمعة ٨ ـ مسلم، الطهارة ٤٢ ـ أبو داود، الطهارة ٢٥ ـ الترمذي، الطهارة ١٨ ـ النسائي، الطهارة ٧ ـ إبن ماجة، الطهارة ٧ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ١/٨٠.

جا لەبەرئەوەی پێغەمبەری ڕەحمەت(عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) لە خەمی ئەوەدا بوو ئوممەتەکەی نەخاتە نارەحەتی و ئەزیەتەوە، فەرمانێکی لەم جۆرەی نەداوە. ئەگەرنا ئەوکات سیواك کردنیش هەروەك دەستنوێژ، دەبوو بە یەکێك لە فەرزەکانی نوێژ. شتێکی واش لەگەڵ بنەمای ئاسانکاری کە لە ڕۆحی ئەم دینەوە سەرچاوەی گرتووە، یەکی نەدەگرتەوە. چونکە زەحمەتە هەموو کەسێ لە هەموو شوێنێکدا سیواکی دەست بکەوێت...

بەکارهێنانی سیواك فەرز نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لە سوننەتە گرنگەکان. زانایانی پێشین چەندین بەرگ کتێبیان دەربارەی ئەم بابەتە نوسیووە. لێکۆڵەرە هاوچەرخەکانیشمان، چەندین توێژینەوەی زانستییان لەمەڕ ئەم بابەتە، بەرەهەندە جیاوازەکانییەوە بەئەنجام گەیاندووە. إن شاء الله لە داهاتوودا ئەو باسانەش دەخوێننەوە...

سیواك، واتە "پاککردنەوەی ددان". دیارە ئەمەش تەنیا بە سیواك ناکرێ، بەڵکو پەنجە، خوێ، مەعجوون یاخود شتی تریش دەکرێ بەکاربهێنرێت. بەڵێ، هەرکەسە و بەو شێوەیەی دەیەوێ، دەتوانێ ددانی پاك بکاتەوە، کەسیش مافی ئەوەی نییە لە بەرامبەر ئەمەدا هیچ بڵێ. بەڵام دەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێ کە سیواکیش کۆمەڵە خاسیەتێکی تایبەت بەخۆی هەیە.

ئێستا بیر لە دینێك بکەنەوە کە موبەلیغەکەی (نەك دامەزرێنەر و دانەرەکەی. چونکە دامەزرێنەر و دانەری دین، تەنها خوای گەورەیە(جَلَّ وَعَلَا). سەروەرمان ڕاگەیەنەر و تەبلیغکاریەتی) فەرمان دەدات ڕۆژی پێنج تا دە جار سیواك بکرێ و، بەکارهێنانیشی وەك سوننەتێك داناوە. بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین: ئیسلام هەر لە زووەوە چەمکی پاکژیی دەم و ددانی هاوچەرخی لە دواوە بەجێهێشتووە. لە ڕاستیدا وا نازانم تەنانەت پزیشکەکانی ددانیش چ

جای خەڵکی ئاسایی، ڕۆژی پێنج تا دە جار ددانیان بشۆن. ئەمە لە کاتێکدا کە ددان پاکردنەوەی ڕۆژانەی سەروەرمان ـ بە لایەنی کەمــەوە ـ خـۆی لـەم ژمارەیەدا دەبینییەوە. ئەوەتا شەوانە چەند جارێك هەڵدەستا بۆ نوێـژ و، لـە پێش هەر نوێژێکیشدا سیواکی بەکاردەهێنا.[1] ئینجا لە نوێژی بـەیانی، هـەر دوو نوێژی ئیشراق و ضحی، نیوەڕۆ و عەسر و شێوان و خەوتناندا، هـەروەك لە کاتی دەستنوێژ و بەر لە نوێژکردنیشدا بەردەوام سـیواکی دەکـرد. ئەمـە سەرباری ئەوەی کە لە دوای هەر خواردنێکدا هەرگیز پاککردنەوەی ددانەکانی پشتگوێ نەدەخست. جا ئەگەر هەمووو ئەمانە بژمێرین، پـێم وایـە سـیواك کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) واتە پاکژکردنـەوەی دەم و دانــی، ئـەو ژمارەیـە تێپەڕ دەکات کە لە سەرەوەدا ئاماژەمان پێدا.

## ٦ ـ هاوسەنگی لە خواردن و خواردنەوەدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا دەربارەی پزیشکی خۆپارێزی، دەفەرموێ:

ما مَلأ ابْنُ آدم وِعاءً شَرًا مِنْ بَطنه، بِحَسَب ابنِ آدم أكلاتٍ يُقِمنَ به صُلْبهُ، فإن كانَ لامحالةَ فَثلثٌ لطَعامِهِ، و ثُلثٌ لشَرابِه، و ثُلثٌ لِنَفَسِه.[2]

" خراپترین شتێك کـە ئـادەمیزاد پـڕی کردبێـت، سـکیەتی. ئـادەمیزاد ئەوەندەی بەسە کە چەند پاروویەك بخوات و پشتی خۆی پێ ڕاگرێـت. ئەگـەر هەر نەیتوانی وا بکات، ئەوا با گەدەی دابەش بکات: سێیەکی بـۆ خـواردن، سێیەکی بۆ خواردنەوە، ئەو سێیەکەشی ماوەتەوە بۆ هەناسەدان."

---

١ - البخاري، الوضوء ٧٣ ـ مسلم، الطهارة ٤٢-٤٨.
٢ - الترمذي، الزهد ٤٧ ـ إبن ماجة، الأطعمة ٥٠ ـ أحمد إبن حنبل، المسند ١٣٢/٤.

هەروەها چەند فەرموودەیەکی تریش هەن، کە دەبنە پاڵپشتی ئەم فەرموودەیە. لە یەکێك لەوانەدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

أَخْشَى مَا خَشِيتُ عَلَى أُمَّتِي كِبَرُ الْبَطْنِ وَمُدَاوَمَةُ النَّوْمِ وَالْكَسَلُ وَضَعْفُ الْيَقِينِ.[1]

" زۆرترین شتێك دەربارەی ئوممەتەکەم لێی بترسم: ورگنی و زۆر خەوی و تەمبەڵی و لاوازیی یەقینە."

ئەو تایبەتمەندییانەی لە فەرموودەکاندا باس کراون، دەرەنجام لە دەوری هەمان خاڵدا کۆدەبنەوە. بەڵێ، مرۆڤێك کە سەرتاپای ژیانی بێ"مراقبة" و "محاسبة" و غافڵانە بەسەر دەبات و، زۆربەی تەمەنی بە خەو دەگوزەرێنێ، بێگومان قەڵەو و ورگنیش دەبێ. تا قەڵەوتریش بێ، زیاتر دەخوات. تا زیاتریش بخوات، ئەوەندەی تر خۆی دەداتە دەم غەفڵەتەوە. یاخود دەتوانین لە هۆکاری یەکەمەوە دەستپێبکەین و، بڵێین: هەرکەسێ زۆر بخوات، بەدڵنیاییەوە زۆریش دەخەوێ، ئەوەشی زۆر بخەوێت بێ هیچ گومانێك یەقینی لەلا دروست نابێت.. بۆیە لە هەرکام لە گۆشەکانەوە بۆ ئەم بابەتە بڕوانین، دەبینین کە هەموو ئەمانە کۆمەڵە پاڵنەرێکن وا لە پێغەمبەری خوا دەکەن خەمی ئوممەتەکەی بخوات.

بەڵێ، لێرەدا دیسانەوە قسە حەواڵەی سیما ناوازەکانی جیهانی پزیشکی دەکەین و لەگەڵ شیکارە زانستییەکانی ئەواندا بەجێتان دەهێڵین. لە پاش خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی توێژینەوەکانیان، بۆتان دەردەکەوێت کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بەر لە چەندین سەدە فەرموونی،

---

١- سیوطی، الجامع الصغیر ١/٢٤ ( لە "الأفراد"ی "الدارقطني"یەوە گێڕاویەتەوە.)

عەینی حەق و حەقیقەتن و، شتێکی ناڕاستەقینە با بچووکیش بێت لە ئاخاوتنەکانیدا بەرچاو ناکەوێت...

## ٧ ـ "کل"ی چاو

ئێستاش دەمەوێت بچینە سەر فەرموودەیەکی تر. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:

إنَّ خَيرَ أكحالِكُم الإثمد، يَجْلو البَصَر وَ يُنْبِتُ الشَّعرَ.[1] " باشترین کلێك بەکاری بهێنن، "ئەسمەد"ە. ئەم کلە دیدە ڕۆشن دەکاتەوە و مووی برژانگیش بەهێز و درێژ دەکات."

دکتۆرە زیهن و دڵ ڕۆشنەکانمان دەڵێن: باشترینی ئەو دەرمانانەی کە تا ئێستا بەکار هێنراون بۆ بەهێزکردنی چاو و برژانگ، بریتییە لە کل، کە پێغەمبەری نازداریشمان ڕێنمایی کردووە. ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە پێشبینی ئەوە دەکەین کە بەکارهێنانی کل لە ساڵانی داهاتووی دنیای جوانکاریدا، ببێتە دیاردەیەکی دیار و بەربڵاو. یەکێکی تر لەو ماددانەی کە هاوشانی کلە و، بەهۆی پارێزگاری کردنی لە پێست و، کاریگەرییە دژە زیندەییەکەیەوە(antibiotic) پێغەمبەری خوا ئامۆژگاری بەکارهێنانی کردووە، خەنەیە.[2] توێژینەوە زانستییەکان دەریانخستووە کە توانای تەعقیم کردنی خەنە، تەنانەت لەو ماددانەش کە بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێن، وەك "گیراوەی ئایۆدین" و "مێرۆفسیلۆن" بەهێزترە.

---

١ - الترمذي، اللباس ٢٣ ـ إبن ماجة، الطب ٢٥.
٢ - الترمذي، اللباس ٢٠ ـ الطب ١٣ ـ أبو داود، الترجل ١٨.

## ٨ - ڕەشکە

لــە فەرموودەیەکــدا کــە ئیمــامی بوخــاری لــە ئــەبوو هــورەیرەوە(ﷺ) دەیگێڕێتەوە، پێغەمەبەری نازدار دەفـەرموێ: إِنَّ فِـي هَـذِهِ الْحَبَّـةِ السَّـوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلاَّ السَّامَ.[1] " ئەم دەنکە ڕەشـکەیە دەرمانــە بــۆ هــەموو دەردێك جگە لە مەرگ."

دەستەواژەی"هەموو دەردێك"، لە زمانی عەرەبیدا کینایەیە بۆ زۆریــی. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگــەر بخرێتــە بــەر نەشــتەری توێژینەوەیــەکی بنــەڕەتی و لێکۆڵینەوەی جددیی لەسەر بکرێت، کێ دەزانێ چارەسەر و دەرمانی چەندەها نەخۆشی لێ دەدۆزرێتەوە. هەروەها فەرمایشتە پیرۆزەکــە ســەرنجمان بــۆ لای دوو خاڵ ڕادەکێشێت:

یەکەمیان: ڕووی شیفابەخشی ڕەشکەیە.

دووهەمیان: تەنانەت ڕەشکەش چاری مەرگ ناکات.

جا با لێرەدا ڕووی زانستیی ئەم باسە بۆ پسپۆڕانی ئەم بوارە بەجێ بهێڵین و، هەڵوێستە لەسەر یەك دوو خاڵ بکەین:

لە کاتی نەخۆشیدا و، بەتایبەت لە ماوەی چاکبوونەوە (النقاحة)دا، بوونی ڕێژەیەکی زۆر لــە پــرۆتین لــە خواردنەکانــدا زۆر گرنگــە. لــەپاڵ ئەمەشــدا، دەوڵەمەنــدی لــە گەرمۆکــە (کــالۆری) و ڤیتــامین و، ئینجــا ئاســانیی هەرسکردنیش، بەهەمان ڕادە گرنگن. وا بزانم ئەو شتانەش کە پزیشــکەکان لە کاتی نەخۆش کەوتندا ڕێنمایی دەکەن، هەر ئەمانەن. جا بۆیە دەبێت ئەو خواردنانەی نەخۆش دەیانخوات، پرۆتین و کالۆریی زۆریان تێــدابێت و هــەرس

---

١ - البخاري، الطب ٧ ـ مسلم، السلام ٨٨-٨٩.

کردنیشیان ئاسان بێت. تاکو لە لایەکەوە نەخۆشەکە ئەو هێزەی بێتەوە بەر کە لە دەستی داوە، لە لایەکی تریشەوە لە کاتی هەرس کردندا وزەی زۆر بەکار نەبات. لە ڕۆژگاری ئێستاماندا توێژینەوە زانستییەکان سەلماندوویانە کە هەموو ئەم تایبەتمەندییانە لە ڕەشکەدا بوونیان هەیە. ئەو نموونە بەرجەستانەش کە لە پاش ئەزموون کردن گەیشتوونەتە ئەنجام، نایەنە ژماردن... ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەرگیز لە خۆیەوە قسە ناکات و، تێکڕای ئەو شتانەی باسیان دەکات دێنە دی و، ئەنجامەکان هەمیشە تەصدیقی دەکەن.

## ٩ ـ مێش

جا با بە فەرموودەیەك لە صەحیحی بوخارییەوە، درێژە بە باسەکەمان بدەین. سەرداری مرۆڤایەتی(ﷺ) دەفەرمووێ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً وَفِي الآخَرِ شِفَاءً.[1] " ئەگەر مێش کەوتە ناو قاپی (خواردن یان خواردنەوە)ی یەکێکتانەوە، ئەوا با هەمووی نوقم بکات و لە پاشان فڕێی بدات. چونکە لە یەکێك لە باڵەکانیدا دەرد و، لەوی تریشیاندا شیفا و دەرمان هەیە."

یەکەم: پێش هەموو شتێك، لەو ڕۆژگارەدا کەس نەیدەزانی مێش هەڵگری میکرۆبە. کاتێك مێش دەکەوێتە ناو شلەمەنییەکەوە، بۆ پاراستنی خۆی، هەوڵدەدات یەکێك لە باڵەکانی بە بەرزی بهێڵێتەوە. واتە هەر دوو باڵی نقوم ناکات لە شلەکەدا. تاکو کاتێك ڕزگاری دەبێ، باڵە وشکەکەی کرداری فڕینی بۆ ئاسان بکات. ئیتر بەم شێوەیە مێشەکە دەفڕێ، بەڵام ئەو میکرۆبانەی کە

---

١ - البخاري، بدء الخلق ١٧ ـ الطب ٥٨ ـ أبو داود، الأطعمة ٤٨.

لەناو خواردن و خواردنەوەکانماندا بەجێی هێشتووە، تووشی نەخۆشیمان دەکەن.

دووهەم: لە حاڵەتێکی وادا ڕێنمایی دەکرێت کە: مێشەکە بەتەواوی نوقمی دەفرەکە بکرێ و، دواتر دەربهێنرێ و فڕێ بدرێ. چونکە لە یەکێك لە باڵەکانیدا میکرۆب و، لەوی دیکەشیاندا دەرمانێك هەیە کە کاریگەری و زیانی ئەو میکرۆبە ناهێڵێت. جا لەو کاتەدا کە مێشەکە لە تاو ترسی لەناوچوون باڵە فرتێ دەکات، بەدەستدان لە پشتی، ئەو کیسە دەتەقێت کە دەرمانەکەی تیادا ئەمبارکراوە. ئیتر بەو شێوەیە مێشەکە ئەو میکرۆبە لەناودەبات کە باڵەکەی تری هەڵیگرتبوو.

ئەو زانایانەی بەدواداچوونی ئەم حاڵەتەیان کردووە، دەڵێن: کاتێك دەستمان نا بە پشتی مێشەکەدا، لە ڕێگەی مایکرۆسکۆپەوە بینیمان کە چەند بوونەوەرێکی مایکرۆسکۆپی بەملاو ئەولادا پەرش و بڵاو بوونەوە. لە لێکۆڵینەوەکانی دواترماندا بۆمان دەرکەوت کە ئەوانە چەند کارمەندێکی تایبەتن بە کرداری تەعقیم کردنەوە.

## ١٠ ـ خوێنی بێنوێژی

دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە: " ڕۆژێکیان "فاتمەی کچی حوبەیش" هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: 'ئەی پێغەمبەری خوا، بە هیچ شێوەیەك خوێنم ناوەستێتەوە و بەردەوام لە سووڕی مانگانەدام، جا ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟' پێغەمبەری خواش لە وەڵامدا فەرمووی: " نەخێر، ئەوە خوێنی سووڕی مانگانە (حیض) نییە، بەڵکو گرفتێکە لە دەمارەکانی خوێندا." [١]

---

١ - البخاري، الوضوء ٦٣ ـ مسلم، الحيض ٦٢.

بەڵێ، پاش تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیە، ئینجا بۆمان دەرکەوت کە سەرچاوەی خوێنی حەیض خوێن بەربوونێکی ناوەکییە. ئیتر بۆ جارێکی تریش لە بەرامبەر ئەو زاتەوە سەراسیمە و حەیران دادەمێنین. داخۆ ئەبێ پێغەمبەری خوا(صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەو سەردەمەدا چۆن ئەم بابەتەی زانیبێ، کە تەنها لەڕێگەی توێژینەوە زانستییەکانی ئەمڕۆوە سەلمێنراوە؟ بێگومان لە ڕێگەی هەواڵ پێدانی پەروەردگارییەوە.. بەڵێ، پەروەردگاری فێری دەکرد، ئیتر ئەویش دەیزانی. تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش، چەندین ڕەهەندی جۆراوجۆری هاویشتە سەر ئەو گەوهەری دەربڕینە. قسەی زانایانیش لەم ڕووەوە ئەوەیە کە، خاوەنی ئەم وتەیە جگە لە پێغەمبەر ناکرێ کەسێکی تر بێ.

## ١١ ـ لە "مەی"دا دەرمان نییە

تاریقی کوڕی سوەید(رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: پێش ئەوەی مەی حەرام بکرێ، بۆ چارەسەری هەندێ لە نەخۆشییەکانمان بەکارمان دەهێنا. کاتێك حەرام کرا، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا و مەسەلەکەم عەرز کرد. پرسیاری ئەوەم کرد کە ئایا مۆڵەت هەیە مەی بەکاربهێنرێت بۆ تەداوی و چارەسەر. لە وەڵامدا فەرموویان: إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ.[١] " نەخێر، مەی خۆی بۆ خۆی نەخۆشییە، هەرگیز نابێتە دەرمان."

لە زۆربەی ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا، چەندین کۆنفراس و کۆڕبەند دەربارەی ئەم بابەتە بەستراون. لە هەمووشیاندا زانایان و لێکۆڵەرەوان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی تەنانەت تاکە دڵۆپێکیش لەمەی بەسە بۆ ئەوەی

١ - مسلم، الأشربة ١٢ ـ الترمذي، الطب ٨ ـ الطحاوي، شرح المعاني ألآثار ١/١٠٨.

که کۆمەڵێك شیتەڵ بوونەوە و پووکانەوە لـە پێکهاتـەی فیزیکـی و ڕۆحـی مرۆڤدا بێنێتە کایەوە. جا هەروەك دەبینین ، پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بـەر لـە چەندین سەدە پەنجەی خستووەتە سەر ئەم بابەتە و، ڕایگەیانـدووە کـە مـەی خۆی لە خۆیدا نەخۆشییە.

## ١٢ ـ خەتەنە کردن

پێغەمبـەری خـوا(عَلَيۡهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ) پێـنج شـت بـە بەشـێك لـە فـیترەت دادەنێت. یەکێکیش لەوانە خەتەنە کردنە.[١] جا با بزانین زانایان لەمبارەیـەوە چی دەڵێن؟ مەگەر ئـەوانیش هـەمان ڕاسـتییان نەسـەلماندووە کـە: پێسـتی خەتەنـە، شـوێنی کۆبوونـەوەی میکرۆبـە و، ئەندامێکـە مەترسـی دڕان و تووشبوون بە شێرپەنجەی هەیە. تاکە ڕێگەچارەش، بریتییە لە خەتەنە کردن.

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە خۆرئاوا لەم مەسەلەیەشدا، زۆر لەپێش هەندێ لە دەبەنگە سەرخۆشەکانی لای خۆمانەوەیە. ئەمڕۆ ژمارەی ئەوانەی کـە لـە ئەمریکا و بەریتانیادا خەتەنە کراون، دەگەنە ملیۆنەها.

تکا دەکەم ڕێم بدەن لێرەدا وتەیەکی کەڵە شایەتی ئەم چـەرخەتان عـەرز بکەم، کە لە ڕێگەی بیرکێشییەوە هاتەوە بیرم: " خۆرئاوا سکی پڕە بە ئیسلام و، ڕۆژێکیش دێت کە دایبنێ. هەروەك چۆن دەوڵەتی عوسمانیش سکی پڕە بە خۆرئاوا، ڕۆژێك دێت ئەویش سکەکەی دادەنێت."[٢]

ئەم وتەیە کە حەفتا ـ هەشـتا سـاڵ بەر لـە ئێسـتا وتـراوە، بەشـێکی هاتۆتەدی.. ئیتر ئێستا ئێمەش، بەچاوی پڕ ئومێد و هیواوە لـە چـاوەڕوانیی لەدایکبوونەکەی تردایین. ئەوەتا ژانی لەدایك بوونەکە تاوی سەندووە. إن شاء

١ - البخاري، اللباس ٦٣ ـ الأستأذان ٥١ ـ مسلم، الطهارة ٤٩.
٢ - بديع الزمان سعيد النورسي، السيرة الذاتية.

الله لــە داهاتوویــەکی زۆر نزیکــدا، گریــانی مژدەبەخشــی ئــەو کۆرپەیــە دەبیسترێت...

تا ئێـرە، لـە ئاسـت ڕاسـتگۆیی و دروسـتیی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و پێغەمبەرانی تر(ﷺ)دا هەڵوێستەمان کرد. هەر پێغەمبەرێك لە ڕاستگۆیی و دروستیدا لە لوتکەدایە. درۆ نەیتوانیوە لە ژیانیاندا هێندەی گەردیلەیەك جێ بۆ خۆی بکاتەوە. جا ئەگەر تۆسقاڵێك لارو خێچی لە خۆیاندا هەبووایە، ئەوا نەیاندەتوانی ڕێنمایی هیچ کەسێك بکەن بەرەو ڕاستەڕێ. خۆ دیارە ئەوان بـۆ ئەوە نێرراون تا مرۆڤایەتی بخەنە سەر ڕێگەی ڕاست و، پێناسی ئەو شارێگەیە بکەن کە بەرەو بەهەشت دەیانبات. بەڵێ، ئەگەر واتای ڕاستگۆیی و دروستی بەرجەستە ببووایە، ئەوا سیفەت و ئاکاری پرشنگداری پێغەمبـەرانی تیـادا دەبینرا...

لەم نێوەندەشدا بینیمان کە ڕاست و دروستیی سـەروەرمان، بـە هـەزاران بەڵگەی نێوان ئەزەل و ئەبەد، پشگیری دەکرێ. ئەوەبوو بەڵگـەکانمان بەسـەر سێ کۆمەڵەی سەرەکیدا پۆلێن کرد. دەبێ ئەوەش بزانرێت کە ئێمـە خۆمـان ئەو پۆلێن و شێوازی خستنەڕووەمان پەسەند کرد. ئەگەرنا، دەکرێ ڕاسـت و دروستیی ئەو زاتە(ﷺ) بە هەزارەها دانراو و سەدەها هەزار بەڵگـە و، شێوازی جۆربەجۆر باسبکرێت. جا بۆ کەس هەیە بتوانێت دوا وتـەی ئـەم بابەتە بڵێ و خاڵی کۆتایی دابنێت..؟! بڕوامان وایە کـە تـا ڕۆژی قیامـەت فەرمایشتەکانی هەمیشە ڕاست دەردەچن و، مرۆڤـی هـەر سـەردەمێکیش، ڕەهەند و لایەنێکی تری نوێی ڕاست و دروستیی ئەویان بۆ دەردەکەوێ. ئـیتر ئەوسا لە قوڵایی و ڕەهەندێکی تردا پێی شاد دەبن.

جا خۆ لە ڕۆژی دوایدا، ڕاست و دروستیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەهەموو ڕوونییەکیەوە بۆ گشت لایـەك نمایـان دەبـێ.. بـەڵێ هەرکەسـەو بـەگوێرەی

ناردنەوەی ڕۆحی خۆی، حەقمان ئەو فەرمایشتانە دەبینین کە دەربارەی زات و سیفات و ئەسماء فەرموونی وە دەرك بە حەقیانەتی ڕشەکانی دەکات، بەڵێ، بەهەشت و دۆزەخ، حۆری و غیلمانەکان ڕێك بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خوا بۆی وەسف کردووین؛ دێنە پێشمان. ئیتر ئەوانیش بە زمانی ئەبەدییەت بەو پێغەمبەرە ئازدارە دەڵێن: "صَدَقتَ"...



# نووری نەمر

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و، ویلی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یان درەنگ، مایەپووچی و بێ ناکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیوە.

ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی ئەو بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و، بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و، چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. ئیتر ئەو کات بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە، دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکا ...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا، ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیووە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و، بە وێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن: ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟ " بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بێت و هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبێت...






نرخ ٣٠٠٠ دینار

